**ئەم کتێبۆکەیە پێشکەش بێت بە هەموو منداڵانی وڵاتەکەم.**

---

**مامۆستای هێژا !**

**دایک و باوکی بەڕێز !**

**ئەوەیکە لەم کتێبۆکەیەدا دێتە بەرچاوی پڕ سەرنجتان، من قەت پێم وانییە تاکانەیەکی یەکدانەیە و، نایابترین و ڕەسەنترینی ئامرازی ڕاهێنان و پەروەردە کردنی جگەرگۆشەکانی کوردە و دوایی بە هەموو شتێک دێنێت.. نەخێر هەر نەک ئەم بەرهەمە بچووکە، بەڵکە چی بەدوای ئەمە و ئەوانی تریش دا دێن، هیچیان ناتوانن ببنە خاڵی ئاخر و لە کۆتایی ئاخر ڕستەی ئەم بوارەدا دابندرێن. چونکە هەتا گەشە و نەشە و پێشوەچوونی زانستی بەرەی مرۆڤ لە ئارا دا بێت، لە زانستی ڕاهێنان و پەروەردەکردنیشدا تازە دێت و سەری کۆن دەخوات و خۆیشی کۆن دەبێت و هەر بەو دەردە دەچێت کە کۆنەکانی تری پێچوون. بەڵام مەبەست لە نووسین و پێشکەش کردنی ئەم بەرهەمە چەند لاپەڕەیە، هەربەس نیاز و ئارەزووی خۆمە تێدا بەستە بووە و چی تر. دەبا بە گوتەیەکی ڕاست و ڕەوانتری بێژم، کە ئەمە مزە و مافی خۆمە و خۆم دەیدەمەوە بەخۆم؛ مزە و مافێک کە بە بۆنەی تێپەڕینی بیست و هەشت ساڵ دەرس گوتنەوەی پڕ لە کارەساتی مامۆستایەتیم، پێشکەش بە بیر و یادگارە لە گیان چەسپاوەکانی خۆمی دەکەمەوە ؛ بیر و یادگارانێک کە یەکدەم لێم دوور نابنەوە و قەت لە مێشکم هەڵناقرتێن. بیر و یادی ئەو کیژ و کوڕە تێکۆشەرە ئازیزانەم مەبەستە، کە سەر و سەدەمێک زارۆکی تازەپێگرتووی پۆل و کلاسەکانی من و ئەوانی تر بوون.. گەورە بوون و ڕسکان و هەڵیان دا و بوون بە پێشمەرگە و لە مەتەرێزی شەرەف دا گیانی پاکیان دەبەر ئاواتی گەلەکەیان مراند. پێشکەش بە هەموو ئەو یاد و بیرەوەییە بایەخدارە هێژایانەمان، کە خۆمیان تێدا دەبینم و ئەگەر ئەوانم نەمێنن، هیچم نامێنێت.**

**بەڕێزان !**

**ئەوەیکە ڕوون و خۆیا و ئاشکرایە، ئەمەیە کە نووسینی کتێبی ڕاهێنان و پەروەردەکردن کارێکی یەکجار زۆر حەستەم و گرنگە و، قەت نابێ تاکە کەس خۆی لە قەرەی بدات و یەکتەنە و دڵخواز خۆی بەم گۆمە مەندە قووڵە دابکات. لە ڕاستیدا، کتێبی ڕاهێنان و پەروەردەکردن، ئەویش بە تایبەت کتێبی پۆلی یەکەمی سەرەتایی، کە هەست و مێشکی ناسکی منداڵ شەقڵ لێ دەدات و یەکەمین بەردی بناغەی کەسایەتیی منداڵ پایەڕێژی دەکات، ئەرک و وەزیفەی سارشانی کۆمەڵێک پسپۆڕی لێهاتووی زانایە و، دەبێ ئەوان بە کۆمەڵ و بە پۆل وەباڵی ئەم حەڵاڵە وە ئەستۆ بگرن، خۆ ئەگەرچی کورد پیاوی زانا و پسپۆڕی کەم نین و، لە خودای بەزیاد بێ، دەکرێ بڵێین بە هەزاران و هەزارنن، لێ مخابن چەلێ هیچ دوو زانایەک، هیچ دوو**

**هونەروەر و هونەرمەندێک، هیچ دوو پیشەوەرێک، هیچ دوو کرێکارێک، هیچ دوو مامۆستایەک و هیچ دوو ڕەهبەرێک لە ناو ئێمە دا یەک نین و یەکتر بە هیچ نازانن . هەر بۆیە پێم وابووە دانیشتن بە هومێدی یەکگرتن نەخشی سەرئاوە و نەخشی سەر ئاو قەت نابێتە گوڵ و لە سەر سنگی کەس جێ ناگرێت و قەت بە هیچ نابێت. هەربۆیە منی کەم مایەی بابردەڵەی یەکتەنی کەساس، یەکتەنە و دڵخواز، خۆم بەم دەریا ئەوسەر نادیارە دا کردووە و بوومەتە مەلەوانی ئەم گۆمە مەندە قووڵە.**

**بەڕێزان !**

**لەم کتێبۆکەیەدا ئەم بابەتانەم ڕەچاو کردوون :**

**1 ـ نەزمی لەمێژ داڕێژراوی(ئەلف و بێ)م لە بەرچاو نەگرتووە، واتە بەپێی تەرتیبی پیتی ئەلفبایی نەچوومە پێش. ئەمەش لەبەر ئەوە بووە کە هەوڵم داوە ،هەر لە سەرەتاوە، وشەی زۆر هاسانی یەک کەرتی(یەک سیلابی) دەکار بێنم و وشەگەلێکی کە مێشکی تازەکاری منداڵ تاقەتی پێ ناشکێت، چەلێ خۆیان لێ بپارێزم. بە کورتی هەر ئەو وشە سادانەم دەکار هێناوە کە منداڵ دەگەڵ دەنگ و دەنگبزوێنەکانیان ئاشنا بووە. واتە بەپێچەوانەی کاری هەندە مامۆستایەک، کە هەر لە سەرەتای کتێبەکەیاندا پیتی خوێندراو و نەخوێندراویان لێک هاڵاندووە و وشەیان لێ ساز کردووە، من ئەمەم نەکردووە.**

**2ـ دوای هەر چەند دەرسێک، تەمرینی مامۆستا و قوتابی دەست پێدەکات، کە ئەم بەشە گرنگترینی بەشی کتێبەکەیە و پێویستە مامۆستا تەمرینەکان بۆ قوتابی بخوێنێتەوە و لە ئەنجامدانیان دا یاریکاریان بێت.**

**3ـ مەشق و تەمرینەکانم بە چەشنێک ئامادە کردووە، کە بکرێت هەر لە سەر کلاسی درس دا کاری لەسەر بکرێت و حەوجێ بە کات و کاری زیاتر نەبێت.**

**4 ـ ئەوەندەی بۆم ڕوخسابێت، نەم هێشتووە ڕەنگ و بۆنی زاراوەی ناوچەیی و هەرێمی بەسەر تێکستەکاندا قورسایی بکات؛ نە زاراوەی ڕەبەق سلێمانی و نە گەڕووسی و نە موکریانی؛ بەڵکە ئەوەندەی بۆم لوا بێت، خۆم لە وەسییەتنامەکەی مامۆستا (هێمن)ی مەزن نزیک کردۆتەوە و بەو زمانە هاتوومەتە گوتن، کە لە قەدیمەوە ئەدەبییاتی نووسراوەی کوردی پێ نووسراوە.**

**5 ـ ڕێنووسێکی بچکۆلانە و دەفتەرێکی تەمرینی(ئەلف و بێ)یشم بە جیا ئامادە کردووە، کە دەفتەری تەمرینی ئەلف و بێ، لە یەکەم مانگی دەسپێکردنی دەرس دا، لەژێر چاودێری و ڕێنوێنیی مامۆستا و دایک و باوکە بەڕێزەکاندا بە ئەنجام دەگات.**

6 ـ لە نووسینی ڕستە و فێرکردنی ڕستەدا ، ئەوەندەی بۆم لوابێت ، ڕستەی هاسان و وشەی کورتی یەک کەرتی و وشەی خوێندراوی دەرسی پێشووم هێناوەتەوە. دیارە لە بەشی (تەمرینی مامۆستا و قوتابی) دا ، وشەی تازەش گونجێندراوە ، کە قوتابی بە یارمەتیی مامۆستای بەڕێز فێریان دەبێت.

7ـ لە تێکستەکاندا ، هەر لە سەرەتاوە هەوڵی ئەمە دراوە کە نیشانەگەلی وەک: دانانی (نوختە)، واتە خاڵی ئاخر لە کۆتایی ڕستەدا(.) ، دانانی کاما(،) لەجێگای پێویست دا و هەوەها نیشانەی پرسیارکردن(؟)، نیشانەی سەرسوڕمان(!) نیشانەی وتووێژ (:ـ) بە منداڵ بناسێندرێت کە لێرەدا ئەرکی مامۆستای بەڕێز و خۆماندووکردنی دایک و باوکە دڵسۆزەکانە هومێدی سەرکەوتنی منداڵەکان مسۆگەر دەکات.

8 ـ ئەوەندەی توانیبێتم ، هەوڵم داوە کەرەسە و ئامێر و ئامرازی کۆنی وەک (داس ، دەستاڕ ، گاسن ، سوێنە و سەلە و سەبەتە و...) کە بەرە بەرە لە بەر دەستاندا نەماون و تەنانەت ناوەکەیشیان بەرەو بیرچوونەوە دەچێت ، لە تێکست و دەرسەکاندا نەیان هێنم .

9 ـ بۆ هەر دەرسێک ، چەند وێنە و ڕەسمم نەخش کردووە ، کە هێچ کام لە وێنە و ڕەسمەکان لە سەتاسەت کاری خۆم نین. دەکرێ بڵێم هەر هەموویانم لە ئینترنێت هێناونەتەوە و پاش سەر و گوێ بڕین و ڕەنگ و بۆیە لێدانێک ، کردوومنەتە نەخشی بابەت بۆ تێکستەکان. بۆ وێنە ، کچ و کوڕی چینی و ژاپۆنی ـ م وەرگرتووە ، جلکی کوردیم دەبەر کردوون و کردوومنەتە کورد. دیارە بە هۆی دەست و قەڵەم کۆڵیم لە نەخشاندن و ڕەنگاندن دا ، ئەم ئاڵوگۆڕ و مۆنتاژکردن و ڕەنگ و بۆیە لێدانەش کات و وەختێکی فرە زیادی گرتووە و دەکرێ بڵێم بۆ سازکردنی هەر وێنەیەک ، چەندین کاتژمێر (کات)ی ویستووە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش لەوانەیە نەخش و وێنەکان زۆر لە بەر دڵان نەبن و هاو واتای تێکستەکان نەیەنەوە ، هەربۆیە هیوادارم کەسێکی دەست و قەڵەم ڕەنگین هەڵکەوێ و کەم و کووڕییەکانم بۆ پڕ کاتەوە. زۆر پێویستە داوای لێبوردن لەو هونەرمەندە هێژایانە بکەم کە بە بێ پرسی پێشەکی ، تابلۆی هەڵپەڕکێ و نەورۆز و چەند وێنە و نیگاری ئەوانم لە ماڵپەڕی (سنە)دا بە قەرز وەرگرتووە و لەکتێبەکە دا گونجاندووەمن. دیارە ئەگەر دەستم بە هونەرمەندانی هێژای وەک: کاک مێهدی زیائودینی و کاک بێهزاد تارا و هونەروەرانی هێژای دیکە ڕابگات ، سپاس و پێزانینی خۆمیان پێ ڕادەگەیەنم و ئەگەر قەت نەتوانم زیارەتیان بکەم ، ئەوا دەبێ بڵێم پشک و بەشی ئەوانیش لەم کتێبۆکەیە دا هەیە و جێیان لە سەر سەر و لە سەر چاوانی منە.

لە کۆتایی دا پێویستە بڵێم کە هاوڕێی تێکۆشەرم ، مامۆستا ڕەشاد مستەفا سوڵتانی لە سەرەتای کاردا ئەرکی پێداچوونەوەی کتێبۆکەکەی گرتە ئەستۆ و لە تاریخی (96/1/30)دا بە ناردنی نامەیەکی بەنرخ ، گەلێک هەڵەی بۆ دەسنیشان کردم و گەلێکی ڕێنوێنی کردم. من لەم

بابەتەوە زمانی سپاس و پێزانینم کورتە و، هەر هیواخوازم کە وێنەی ئەم جوانمێرانە لە نێوماندا زۆر بێت و سایەیان لە سەری ئێمە کەم نەبێتەوە.
لە ئاخر سەر دا دیسان دووپاتی دەکەمەوە و دەڵێم کە ئەم بەرهەمە بچووکە، بە هەموو کەم و کورِی و نەپوختیشییەوە، ئەگەر بتوانێ بکەوێتە بەر دیدەی خاوەن نەزەران و کەمایەسییەکانی پڕ بکرێتەوە، ڕەنگە ببێتە بیرئانینێک بۆ باشترین ڕۆڵە بە ئەمەگەکانی کوردستانەکەمان و لە هەمان کاتیش دا ببێتە مەزنترینی خەڵات بۆ ڕۆژی کووژانەوەی بیست و هەشتەمین مۆمی تەمەنی پیشەی دەرس گوتنەوە و کاری مامۆستایەتیم.
هیوام سەکەوتنی دایک و باوکە دڵسۆزەکان و مامۆستا بەڕێزەکانە و، بەهیوام کەمی من بە زۆر بزانن.

بە ئەوپەڕی ڕێزەوە کەریم دانشیار ـــ سوید 25ی سەرماوەزی1994.

ئاخر قسەم ئەمەیە و ناکرێت فەرامۆشی بکەم، کە ئەم کتێبۆکەیە هەرچەند زۆر لەمێژە بۆ چاپ و بڵاو بوونەوە ئامادە کرابوو و، ئەگەرچی لە لایەن بەڕێوەبەرانی نووسینگەی ئۆرگانێکی کوردی لە ستۆکهۆڵم _ یش دەستی چاپکردنی هەرچی زۆتر(ئورژانس)ی بۆ لەمل درا و ئۆرژینالی کتێبەکەیشان بۆ چاپکردن بە پەلە لێ وەرگرتم، بەڵام درۆیان دەگەڵ کردم و ئۆرژیناڵەکەشم تێدا چوو، بە ناچار دوو ساڵ و حەوت مانگی تر خەریکی بوومەوە و سەر لەنوێ سازم کردوە و لەو ساوە هەتا ئیمڕۆ، بە هۆی نەبوونی ئیمکانی چاپکردنی، بە چاپ نەکراوی هەر بە سەر دەستی خۆمدا ماوەتەوە و چاوەڕوانی دەرفەتی ڕووناکی بینینە. بە هیوام هەتا زیندووم و ماوم ئەو ڕۆژەی بگاتێ . بە سپاسەوە ـ کەریم .

**مامۆستای هێژا!**

**دایک و باوکی بەڕێز!**

**هەر وەکی ئێوەیش شارەزان و دەزانن، نووسینی کوردی بەم شێوە خەتەی کە هەر ئێستا باوە و پێی دەنووسرێت، چەشنە هونەرێکی قەڵەمکێشان و ڕەسم و نەخشکردنی هەرچی جوانتری پیت و وشەکانە و، ئەم هونەرەش کاتێک وەک دەسکەوت بە قەڵەمبەدەستان دەبڕێت، کە هەر لەسەرەتای منداڵی و دەسپێکەوە، بەشێوەیەکی ڕاست و دروست هەڵس و کەوتی لەگەڵدا کرابێت. بە گوتەیەکی ساکار و ڕەوانتر بێژم کە ئەگەر پەنجەی مرۆڤ لە سەردەمی منداڵییەوە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست بخرێتە کاناڵی هەر کارێکەوە، مێشکی ئەو مرۆڤە لە بواری ئەو کارەدا مۆر و شەقڵی ڕاست و دروست وەردەگرێت و کارامەیی زیاتری پێ دەبڕێت.لەڕاستیدا پێوەندەیی کاری بەردەوامی نێوان پەنجەی مرۆڤ و مێشکی مرۆڤە، کە ژیانی سەرکەوتووی مرۆڤی ئیمرۆکەیی وەدی هێناوە.**

**بەڕێزان !**

**من لەم چەند لاپەڕەیە دا بۆ ڕاهێنانی دەست و قەڵەمی ساوا و تازەکاری منداڵەکانمان ئەم پرۆژە بچکۆلانەیەم پێشکەشی ڕای ئێوەی بەڕێز کردووە، کە زۆر جاران و لە گەلێک کتێبی سەرەتاییدا بەتاقی کراوەتەوە. خۆ دیارە ئەم تەمرینانە ئەو کاتە بەکەڵک و بەهرەدار دەبن، کە منداڵ لە کەش و هەوایەکی تەواو هێمن و حەساوەوە دا دەست بە تەمرینەکان بکات و هیچ جۆرە زەخت و گوشارێکی زۆرەملیی بە سەرەوە نەبێت. نابێ وەک ئەو ئەرک (وەزیفە)یە چاوی لێ بکرێت، کە لە نێو ئێمە دا باوە و هەر بۆ ڕەشکردنەوەی لاپەڕەی کتێبەکەیە و بەس. بە پێچەوانە، دەبێ بە سەبر و حەوسەلەیەکی یەکجار زۆر، دەست بەم کارە بکرێت و سەرنج و چاوەدێریی مامۆستای بەڕێزی بەسەرەوە بێت. لە دەسپێک و هەر لە سەرەتای کارەوە دەبێ مامۆستای هێژا و دایک و باوکە بەڕێزەکان چاوەدێر و یاریکارێکی وردی دەست و قەڵەمی ساواکان بن. چونکە ئەوەیکە منداڵ لەم تەمەنە و لەم هەلە دا فێری دەبێت و پێی ڕادێت، جا بە چاک یان بە خراپ ، وەک نەخشی سەر بەردی لێ دێت و دەبێتە خانەنشینی مێشکی و دەمێنێتەوە.**

بەڕێزان! شێوەی قەڵەمکێشان و شوێن پێی قەڵەم بۆ نووسین و ڕەسمکردنی بەدەنە و چوارئێسکەی ئەو پیتانەی کە خوێندکارە بچکۆڵەکانمان لە یەکەمساڵی خوێندن دا دەست بە فێربوونیان دەکەن، لەم دەفتەرەدا هاتووە. چۆنیەتی کار بەمجۆرەیە :

1ـ شێوەی قەڵەمکێشان بۆ ڕەسمی بەشێک لە هەر پیتێک، بەڕەنگی سوور و بە(زلی)، لە سەردێڕی هەر لاپەڕەیەکدا هاتووە.

2ـ لە بەشی خوارەوەی سەردێڕی لاپەڕەکاندا، هەر هەمان شت چوارجار بە ڕەنگی سوور و کەمێک گەورەتر دووپات کراوەتەوە.

3ـ لە ژێرەوەی ئەو دێڕە دووپاتکراوەیەشدا هەر هەمان شت، بەڵام وردتر، لە دێڕێکدا نووسراوەتەوە.

ئەم دوو دێڕە بەس بۆ دیتنی بارستایی بچووکی و گەورەیی شتەکەیە و بۆ ناسینی پێچ و خەمی ئەو شتەیە کە دەبێ لە خوارەوە تەمرینی لەسەر بکرێت. مەبەست لە بارستایی بچووکی و گەورەیی شتەکەش ئەمەیە، کە منداڵ هەر لە سەرەتای کارەوە بۆی دەرکەوێت هەر پیتێک دەکرێ زۆر ورد، یان زۆر درشت بنووسرێت.

4ـ لە خوارووەی ئەم دوو دێڕانەشدا، چوار دێڕی تەمرین، بەڵام بەشێوەی ڕیزەڵە خاڵی وردی لەیەکتر جیا، هاتووە. لێرەدا، دەست و قەڵەمی منداڵ وەکار دەکەوێت و بە نووکی قەڵەمی تیژکراو بەسەر ڕیزەڵە خاڵەکاندا دەچێتەوە. ئیتر لێرەدا چاوەدێریی مامۆستای بەڕێز و سەرنجی دایک و باوکە ئازیزەکان گرنگایەتی و بایەخی بەرزی یەکجار تایبەتیی خۆی نیشان دەدات.

5ـ لە بەشی هەرە خوارەوەی هەر لاپەڕەیەکدا، دوو دێڕ بۆ دەست و قەڵەمی منداڵەکان دیاری کراوە. لێرەدا، دەست و نەخشی قەڵەمی منداڵەکە دەکەوێتە کار و چی لە جانتای ڕاهێنراوی دایە، دەیخاتە سەر لاپەڕە.

6ـ لە ژێرەوەی هەر لاپەڕەیەکدا هاتووە کە دەست و قەڵەمی منداڵەکان خەریکی تەمرینی کێهە بەش لە چوارئێسکەی کام پیتی ئەلفباییە.

بەهیوام مامۆستای هێژا و دایک و باوکە بەڕێزەکان لە ئەرکی پێ سپێراوی گوشکردن و ڕاهێنانی منداڵەکان دا سەرکەوتوو بن.

بە ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە

25ی سەرماوەزی ساڵی 1994 ـ سوید ـ کەریم دانشیار



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی

بەشێک لە پیتی (ئا) تەمرین دەکات.



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشێکی ئەم پیتانە تەمرین دەکات : ( و . ۆ . وو)



ئـ ئـ ئـ ئـ

ئـ ئـ ئـ ئـ

**لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی هەمزەی سەر پیتی چەقیوی(ئـ) تەمرین دەکات .**



**لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشێکی تری ئەم پیتانە تەمرین دەکات : ( ب . پ . ت )**



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی ئەم پیتانە تەمرین دەکات : ( ب . پ . ت . )



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست دانانی خاڵی ژێر پێی پیتی( ب)
تەمرین دەکات :



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست دانانی خاڵی سەر پیتی(ت) تەمرین دەکات :





لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی پیتی ( ر . ڕ . ) و بەشێک لە پیتی(و . وو . ۆ ) تەمرین دەکات .







لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشێک لە پیتی( ) تەمرین دەکات .



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشێک لە پیتی ( ﮐ ) تەمرین دەکات.





لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی کەوانەی بچووکی پیتی(ی . ێ ) تەمرین دەکات .



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی پیتی( ن) ، هەروەها بۆ بەشێک لە پیتی (س . ش ) تەمرین دەکات .



ســـ ســـ ســـ ســـ

ســـ ســـ ســـ ســـ

لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشی سەرەتای دوو پیتی( س . ش ) تەمرین دەکات .



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشی سەرەتای پیتی (م ) تەمرین دەکات .



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشێک لە پیتی ( م )
تەمرین دەکات .





**لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشی دەسپێکی ئەم پیتانە تەمرین دەکات :** ( ح ، خ ، ج ، چ )



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشێک لە پیتی ( ک . گ ) تەمرین دەکات.



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشی سەرەتای ئەم پیتانە تەمرین دەکات : ( ف . ق . ڤ )



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشێک لەم پیتانە تەمرین دەکات : ( ل . ڵ . )















لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشێک لە پیتی (ـە ) تەمرین دەکات .





لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی بەشی دەسپێکی پیتی (هـ ) تەمرین دەکات :



لەم لاپەڕەیەدا ، دەستی منداڵ بۆ ڕاست و دروست نووسینی چەڵەمەی سەر و ژێری ئەو پیتانە تەمرین دەکات : (ۆ . ڵ . ێ . ڕ .)

# (دەرسی دوو)



ئا ...................... و

ئا......................و

ئاو

ئاو ئاو ئاو ئاو ئاو ئاو



ئاو

ئـ ا و

ئاو ئاو ئاو ئاو ئاو ئاو ئاو

ئـ ا و

## (دەرسی سێ)




ئە




وە

ئە............................... وە

ئەوە

ئەوە ئەوە ئەوە ئەوە ئەوە ئەوە





ئەوە ئاوە .

ئاو !

ئاو !

ئە　　　　ئا　　　　وە　　　　وا





ـ بابە !... ئەوە ئاوە ؟

ـ ئا ... ئا ... ئەوە ئاوە .

بابە ئاو !

بابە ئاو !



بەبە



بەبە



بەبە



باب



ئاو

وە ..................... رە

وەرە



بابە وەرە !

بابە وەرە ... وەرە ئاو !

بابە وەرە ... وەرە ئەوە ئاوە !

بە     با     وە     وا     رە     را

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

لە بەشی ( تەمرینی مامۆستا و قوتابی)دا، ئەرکی هەرە گرنگ دەکەوێتە سەر شانی مامۆستا و دایک و باوکە بەڕێزەکانەوە. مامۆستای هێژا لە هەموو تەمرینەکان دا، بە خوێندنەوەی تێکستەکان دەستی مێشکی ساواکان دەگرێت و لە هەموو ئەم بوارە دا یارمەتییان دەدات. بە گوتەیەکی ڕەوانتر، مامۆستا دەیخوێنێتەوە و قوتابی ئەنجامی دەدات.

**مامۆستا : ئەم وشەیە بخوێنەوە :** ←——● ( **ئاو**)



– ئەم شکڵە دەسکردی (بەیان)ە. بەیان ئەم شکڵەی لە سەر کاغەز ڕەسم کردووە.

– سەیری ژێرەوە بکە و ئەم دوو پرسیارانە وەڵام بدەوە .



**1** ـ ئەم دەسکردەی (بەیان) لە چەند کوت ساز بووە؟

**2** ـ هەر کوتەی چ ڕەنگێکە ؟

ـ وشەی (ئاو)یش لە سێ کوت پێک هاتووە ، ئێمە بە هەر کوتەی وشەی ئاو دەڵێین: (پیت).

ـ وشەی ( ئاو ) لە سێ پیت ساز بووە. پیتەکان ئەمانەن : ( ئـ ).... ( ا ).... ( و )

ـ ئەم وشانەش بخوێنەوە و پیتەکانیان لە نێو کەوانەکاندا بنووسەوە :

بار:( ) ( ) ( ) باب : ( ) ( ) ( )

ـ لە وشەی ( باب ) دا ، یەکەم پیت ( بـ )ی بچووکە و ئاخر پیتیش ( ب )ی گەورەیە.

لەم سێ وشەی ژێرەوە، کامیان لە وێنەی بەرامبەریاندا دەبینی، خەتێکی لە ژێرەوەی بدە :

باب بار ئاو



ـ له دەرسەكانی پێشوو دا دەگەڵ ئەم شكڵ و وێنانە ئاشنا بوون. لێرە دا وێنەكان نیشان دراون و لە بەرامبەریاندا پیتەكانیشان لە نێو خشتەكاندا نووسراون‌بەڵام یەكەم پیتیان لەبیر كراوە و نەنووسراوە. كێ بتوانێ لەنێو خشتە بەتاڵەكاندا  یەكەم پیتی داكەوتوویان بنووسێتەوە، ئافەرینی دایە و بابە و مامۆستا وەردەگرێت.

















ـ ئەم وشانە بخوێنەوە و جارێكیشیان بنووسەوە :

باب  برا  با  بار  بەبە  ئاو  ئەو  ئەوە  ئا

ـ ئەم کابرایە چی پێیە ؟




ـ ئەم پیتانەی ژێرەوە بخوێنەوە و بە قەڵەمەکەت ڕەشتریان بکەوە.

ئـ ا بـ و ر ب



**دار**

**د ........... ا............... ر**

**دار**



**دارا دار !**



دارا وەرە !

وەرە دارا .. وەرە  بابە دار ئاو دەدا .

دادە وەرە !

وەرە دادە.. وەرە بابە دار ئاو دەدا .











**دارا وەرە !**

**دارا وەرە .. وەرە بابە دار ئاو دەدا .**

**دێدە وەرە !**

**دێدە وەرە .. وەرە بابە دار ئاو دەدا .**

**دارا دێ .**

**دێدە دێ .**

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی



دارا



دێدە

دا ............. را

دارا

دێـ ............دە

دێدە

ـ وشەی ( دارا) دوو بەشە .

ـ وشەی ( دێدە ) دوو بەشە .

ـ لە خشتەکانی ژێروو دا پیتەکانی بەشی یەکەمی وشەی (دارا ) و وشەی ( دێدە) نووسراون . تۆش دوو پیتی نەنووسراوی بەشی دووەمی هەر دووک وشەکان لە خشتەی بەتاڵ دا بنووسەوە .

| دارا | د | ا | | |
|---|---|---|---|---|

| دێدە | د | ێـ | | |
|---|---|---|---|---|

ـ یەکەم دەنگی وشەی ( دارا ) ئەمەیە : د

ـ یەکەم دەنگی وشەی ( دێدە) چییە ، لە ناو ئەم خشتە بەتاڵە دا بینووسە:

---

ـ ئەم وشەیە بخوێنەوە : ( باب )

ـ وشەی ( باب ) لە چەند پیت پێک هاتووە ؟

ـ پیتی یەکەم و پیتی ئاخری وشەی (باب) لە خشتە باتاڵەکاندا بنووسەوە.

| | ا | |
|---|---|---|

---

ـ **پیتی (ب) دوو جۆرە.**
**جۆرەکانی ئەمانەن : ( بـ )ی بچووک .... ( ب )ی گەورە.**
**دەنگی ( ێ )یش وەکی پیتی (ب) دوو جۆرە.**
**جۆرەکانی ئەمانەن : ( ێـ )ی بچووک ... ( ێ )ی گەورە .**

---

ـ ئەم وێنانە دەناسی ؟ ئەگەر دەیان ناسی ، ناوەکانیان لە سەر خەتی ژێرەوەیاندا بنووسە.



ـ ئەمانەی ژێرەوە بخوێنەوە و جارێکیشیان بنووسەوە :

دارا وەرە . دێدە وەرە . دادە وەرە . دارا دێ . دێدە دێ . دادە دێ . بابە دار ئاو دەدا .

## ڕاو



دارا وەرە !

دارا وەرە ڕاوە .



ڕێبەر وەرە !

ڕێبەر وەرە ڕاوە .

دێدە وەرە !

دێدە وەرە ڕاوە

دارا دێ .

ڕێبەر دێ.

دێدە دێ .








ڕابە دێدە !

دێدە ڕابە .. وەرە ڕاوە .

ڕابە دارا !

دارا ڕابە .. وەرە ڕاوە .

ڕابە ڕێبەر !

ڕێبەر ڕابە .. وەرە ڕاوە.

**ڕاو**



بابە دار ئاو دەدا .



ڕێبەر دار ئاو دەدا .



دێدە دار ئاو دەدا .

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : ئەم وشە تازانە دەخوێنینەوە:

**ئارد - ڕێ - ئاودار - دار - بەرد - ئاوا - دێو- داو- باو - دەر- دەرد.**

- پیتی یەکەمی سێ وشەی: ( **باب**) ، (**بەرد**) ، ( **بەبە**) چییە؟
- ئەدی پیتی ئاخری سێ وشەی: (**ئاو**) ، (**داو**)، ( **باو**) چییە؟

---

- سەیران پیتەکانی ئەم چەند وشەی خوارەوەی لە خشتەکاندا نووسیوە، بەڵام پیتی ئاخرینی هەموو وشەکانی بیر چووە بینووسێت، کێ بتوانێ پیتی ئاخری وشەکان بنووسێتەوە و وشەکان بۆ سەیران تەواو بکات، ئافەرینی سەیران و مامۆستا و دایە و بابە وەردەگرێت.

### - وشەکان ئەمانەن:

**ڕاو**

| ڕ | ا | |
|---|---|---|

**داو**

| د | ا | |
|---|---|---|

**باو**

| بـ | ا | |
|---|---|---|

**ئارد**

| ئـ | ا | ر | |
|---|---|---|---|

**دارا**

| د | ا | ر | |
|---|---|---|---|

**دادە**

| د | ا | د | |
|---|---|---|---|

**دێدە**

| د | ێـ | د | |
|---|---|---|---|

**باب**

| بـ | ا | |
|---|---|---|

**بەرد**

| بـ | ـە | ر | |
|---|---|---|---|

---







ـ بێری وەرە ڕاوە.. ڕاوە ڕێوی !




ـ دارا وەرە.. ڕێوی داوی دیوە .

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

ـ دوو پیتی (ی) و (ێ) وەک یەک دەنووسرێن ، بەڵام دەنگەکانیان وەکی یەک نین.

ـ ئەمەیان:(ێ) ، کە چەڵەمەیەی لە سەرە ، پێی دەگوترێت (ێ)ی خاو.

(ێـ)ی خاوی بچووک ــ (ێ)ی خاوی گەورە .

ئەم وشانە، پیتی (ێ)ی خاویان تێدایە: **رێ ... رێبەر ... دێو ... رێوی**

ئەمەیان :(ی) ، کە چەڵەمەی لە سەر نییە ، پێی دەگوترێت (ی)ی کرژ.

(یـ)ی کرژی بچووک ــ (ی)ی کرژی گەورە .

ئەم وشانە پیتی (ی)ی کرژیان تێدایە : **دیوار ... دیدار ... دیو ... بــی ... بیبەر(بیبار)**

---

ـ دارا و رێبەر برادەرن. دارا پیتەکانی ناوی (**رێبەر**)ی خستۆتە نێو خشتەی 1 ، بەڵام لە کارەکەی دا هەڵەی کردووە. کێ بتوانێ هەڵەی دارا لە خشتەی 2 دا ڕاست بکاتەوە، ئافەرینی دایە و بابە و مامۆستا و رێبەر وەردەگرێت.

خشتەکان بەمجۆرە پڕ کراونەتەوە:

1- رێبەر

| ـه | ر | بـ | ڕ | ێـ |
|---|---|---|---|---|

2 ـ رێبەر

| ڕ | | | | ر |
|---|---|---|---|---|

ـ ئەمانەی ژێرەوە بخوێنەوە و جارێکێشیان بنووسەوە :

بێری وەرە ڕاوە ، ڕاوی ڕێوی. دارا وەرە ، ڕێوی داوی دیوە. ڕێبەر ئارد دەبا. دادە ئاو دەبا .

- سەیری ئەم وێنانە بکە و وشە داکەوتووەکان بنووسەوەی :



**بابە دار ........ دەدا .** **دارا دار ئاو ....... .**

---

- دوو پیتی (ڕ) و (ر) وەکی یەکن ، بەڵام دەنگەکانیان وەکی یەک نین.

ئەمەیان: (ڕ) ، کە چەڵمەیەکی لە ژێرەوەیەتی، (ڕ)ی گرانی پێ دەگوترێت.

هەر وشەیەک کە بە(ڕ) دەست پێ بکات، (ڕ)ی گران لە پێشەوەی وشەکە دا دێت .

ئەم وشانە (ڕ)ی گرانیان تێدایە : ڕێبەر ... ڕاو ... ڕێ .

ئەمەیان: (ر)، کە چەڵمەی نییە، (ر)ی سووکی پێ دەگوترێت. (ر)ی سووک قەت لە سەرەتای وشەدا نایە.

ئەم وشانە (ر)ی سووکیان تێدایە : بار ... برا ... ئارد ... وەرە ... دار.

---

- ئەم وشانە بخوێنەوە و یەکجاریشیان بنووسەوە :

دار بەرد ئارد دێدە دادە باب بابە ڕابە وەرە دێ ئاو ئاودار

- ئەم پیتانە بخوێنەوە و بە قەڵەمەکەت نێو سگیان ڕەش کەوە :





نان

بابە !... بابە !

بابە وەرە نان !

بابە وەرە ئاو !





بابە وەرە !

بابە وەرە!... بەبە نانــی دەوێ.

بابە وەرە! ... بەبە ئاوی دەوێ .



بابە نان دێنێ .

بابە ئاو دێنێ .

داده وەرە بڕوانە !

بابە نان دێنێ .

داده وەرە بڕوانە !

بابە ئاو دێنێ .





## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

**مامۆستا : ئەمانەی خوارەوە ،(ڕستە)یان پێ دەگوترێت :**

بابە نان دێنێ .          دارا دار ئاو دەدا .

**ـ ڕستە:**

**ئەگەر چەند وشە پێکەوە بێن و مانایەک بدەن ، ڕستەیان لێ ساز دەبێت. وەک:**

**دارا دار ئاو دەدا.**

ئەگەر تۆ بڵێی (دارا)، من هەر ناوی( دارا)م گوێ لێ دەبێ. بەڵام ئەگەر بڵێی:

( دارا دار ئاو دەدا.) من دەزانم ( دارا) کارێکی کردووە.

ئەمانەی خوارەوەش (ڕستە)ن :

دارا نان دێنێ . بابە دار ئاو دەدا .      ڕێبەر و دارا ئاو دێنن .

**لە ئاخری ڕستەدا (خاڵ)ێک دا دەندرێت.**

**پرسیار و وەڵام:**

- کێ نان دێنێ ؟
- دارا چی دەکا ؟
- ڕێبەر و دارا چی دەکەن؟

---

**- ئەم ڕستەیە بخوێنەوە :**

دادە وەرە بڕوانە ، بابە نان دێنێ.

- لەم ڕستەیە دا وشەی (بڕوانە) بە ڕەنگی سوور نووسراوە. لە زمانی کوردیدا هاومانای دیکەی ئەم وشەمان هەیە، کێ بتوانێ دوو وشەی هاومانای ئەم وشەیەمان بۆ بدۆزێتەوە و بیڵێ، هەزار ئافەرینی دایە و بابە و مامۆستا وەردەگرێت.
[ بڕوانە = سەیرکە = تەماشاکە]

---

**- ئەم ڕستەیە بخوێنەوە :**

دارا ڕابە ، وەرە ڕاوە .

لەم ڕستەیە دا وشەی (ڕابە) بە ڕەنگی سوور نووسراوە. لە زمانی کوردیدا هاومانای دیکەی ئەم وشەمان هەیە، کێ بتوانێ یەک یان دوو وشەی هاومانای ئەم وشەیەمان بۆ بدۆزێتەوە و بیڵێ، هەزار ئافەرینی دایە و بابە و مامۆستا وەردەگرێت.
[ ڕابە = هەستە = بەرزەوە بە]

ـ ئەم ڕستەیە بخوێنەوە :

ڕێوی داوی دیوە .

- پرسیار:

1ـ ئەم ڕستەیە چ مانایەک دەبەخشێ ؟

2ـ ئایا پێت وایە ئەگەر ڕێوی داو ببینێ، لە داو دەکەوێ؟

## ـ ئەمە بزانە :

**لە کوردستاندا ڕێوی بە داوێک دەگیرێت ، کە پێی دەڵێن (تەڵە). بەڵام چونکە ئێمە لە سەرەتای فێربوون داین ، چەلێ وشەی(تەڵە) هەر بەس لە ڕێی گوتن فێر دەبین.**

پیتی یەکەمی ئەم وشانە بڵێ :

داو ... ڕاو ... ڕێوی ... نان ... باب ... دیوار ... برا ... ئاو ... ئارد ... دەرمان ... بار ... ڕێ ...

1ـ ئەمانەی خوارەوە چەند پیتن؟

2 ـ لە چەند دەرسی ڕابوردوو دا چەندێک لەم پیتانەمان خوێندووە، ئەگەر بتوانی پیتە خوێندراوەکان بدۆزیتەوە و بە قەڵەمەکەت نێو سگیان ڕەش بکەیت، سەت ئافەرینی مامۆستا وەردەگریت.





سێو



ڕێواس



سێ ڕێواس



سێ سێو




سارا سێو دێنێ .
سارا سێ سێوان دێنێ .

ساوان ڕێواس دێنێ .
ساوان سێ ڕێواسان دێنێ .

سارا سێو دەدا بە ساوان .
ساوان ڕێواس دەدا بە سارا.
باران دەبارێ .



ڕێواس



سێو

بابە ڕێواس دێنێ.

بابە سێو دێنێ.





دادە وەرە !
وەرە دادە..بابە ڕێواس دێنێ.

ڕێبەر وەرە !
وەرە ڕێبەر..بابە سێو دێنێ.

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : ئەم وشانە بخوێنەوە و بڵێ دەنگی یەکەمیان چییە:

سارا– ساوان – سەیوان – سەر – سیر – سەیران – سێوە – سێو –

– دەنگی ئاخری ئەم وشانەی ژێرەوە چییە؟

ڕێواس – ڕێناس – ئەرەس – [ ڕێناس و ئەرەس ناوی دوو برایانە ]

– لە ژێرەوەی ژمارەی (1) دا چەند ڕستەمان نووسیوە. لە ژێر ژمارە(2)ش دا چەند ڕستەی دیکەمان نووسیوە. ڕستەکانی بەری (1) دەگەڵ ڕستەکانی بەری(2) لە یەک دەچن، بەڵام ئەگەر لێیان ورد ببینەوە، جیاوازییان لە نێوان دایە. تۆش ئەم جیاوازییانە فێر ببە.

| (1) | (2) |
|---|---|
| باران دەبارێ . | باران نابارێ . |
| ساوان دێ . | ساوان نایە. |
| دارا دار ئاو دەدا. | دارا دار ئاو نادا . |
| ڕێوی داوی دیوە. | ڕێوی داوی نەدیوە. |

**مامۆستا: پیتی داکەوتووی ماڵی بەتاڵی خشتەکان بدۆزەوە و لە سەر جێی خۆیانیان دابنێ و ئافەرین لە مامۆستا و دایەو بابە وەرگرە.**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ساوان دەیدا بە سارا . | ڕ | ێـ | و | ا | |
| سارا دەیدا بە ساوان . | | ێـ | و | ■ | ■ |
| .... سێ سێوان دێنێ . | | ا | ر | ا | ■ |
| .... سێ ڕێواسان دێنێ. | | ا | و | ا | ن |

ـ ئەم دوو پیتانە پێکەوە دەبن بە چی ؟ تۆیش وەک نموونەی (1) پیتەکان لێک گرێ بدە و بیخوێنەوە :

(1) ئـ .......... ا ........ .... ئا......

(2) بـ ......... ا ..............

(3) نـ .......... ا ..............

(4) سـ .......... ا ..............

ـ ئەم پیتە بچکۆڵەیە ، (بـ)ی بچووکی پێ دەڵێن.

ئەمەش (ب)ی گەورەی پێ دەڵێن.

ـ سەیری ئەم پیتانەی دیکەش بکە و بییان خوێنەوە :

نـ ن

یـ ی

سـ س

ێـ ێ

ـ ئەم پیتانە شێوەی گەورە و بچووکیان نییە و هەر یەک چەشنیان هەیە:

ڕ د و ئـ ر ا

**ـ ئەم دوو پیتانە پێکەوە دەبن بەچی؟ تۆیش وەک نموونەی یەک لە بەری چەپ دا بینووسە .**

**بـ ............. ـە ...... بە........**

**نـ ............. ـە ................**

**یـ ............ ـە .................**

**سـ .......... ـە .................**

**ـ ئەم دوو پیتانەی ژێرەوە پێکەوە دێن ، بەڵام پێکەوە ناچەسپێن؛ ئەم دوو پیتانە لێک نزیک بکەوە و دەنگی هەر دووکیان پێکەوە بخوێنەوە.**

**د ................. ا ..... دا .......**

**د ................ ە ................**

**ڕ ............... ە ..................**

**ڕ................ا ..................**

**ـ دەنگی ئەم دوو پیتانە پێکەوە بخوێنەوە :**

**سا ـ نا ـ ڕا ـ وا ـ با ـ یا ـ ئا ـ دا ـ**

**سە ـ نە ـ دە ـ ڕە ـ یە ـ ئە ـ بە ـ وە ـ**





تارا ئاو دێنێ .　　　ئاوات ئاو دێنێ .　　　تەوار ئاو دێنێ .

تارا و ئاوات و تەوار ئاو دێنن.

بابە دار ئاو دەدا .

دایە دار ئاو دەدا.

دار ئاوی دەوێ .



دایە دار ئاو دەدا.

دایە سێ داران ئاو دەدا .

دایە بێستان ئاو دەدا.



بابە دار ئاو دەدا .

بابە سێ داران ئاو دەدا .

بابە بێستان ئاو نادا.



دارستان



بێستان



دار مار









ئەمە دارە. ئەمە مارە .



ئەمە دارە و ئەمە مارە مار لە نێو داران دا دیارە







مام سارم بابی ئارامە .

مام بارام مامی ئارامە .

بابە وەرە !

مامە وەرە !

وەرن مار !

وەرن بڕوانن مار بە ئاو دا دەڕوا !




ئارام مەترسە !
مەترسە بابــم !
ئەمە دارە بە ئاو دا دەڕوا.
سارم
بارام



## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

**مامۆستا** : ئەم سێ ڕستەی خوارەوە بخوێنەوە:

( تارا ئاو دێنێ . )　　( ئاوات ئاو دێنێ . )　　( تەوار ئاو دێنێ. )

ـ تۆیش دەتوانی ئەم سێ ڕستانە لێک گرێ بدەیت و یەکجێ و پێکەوە بڵێی:

( تارا و ئاوات و تەوار ئاو دێنن ).

ـ دەی ئێستا ئەم دوو ڕستەی خوارەوەش بخوێنەوە :

( دێدە دار ئاو دەدا . )

( ڕێبەر دار ئاو دەدا. )

ـ ئەم دوو ڕستانەی سەرەوەمان لێک گرێ داوە ، بەڵام وشەیەکی گرنگ لە ڕستەکە دا نەماوە، کێ بتوانێ وشە گرنگەکە لە جێی خۆی دابنێتەوە، ئافەرینی مامۆستا وەردەگرێت.

( دێدە و ڕێبەر دار ئاو .................. . )

ـ ئەم سێ ڕستانەش بخوێنەوە :

( بارام وەرە ! )　　( ئارام وەرە ! )　　( سارم وەرە ! )

ـ سێ ڕستەی سەرەوەمان لێک گرێ داوە ، بەڵام ناوەکانمان بیر کردووە، کێ بتوانێ ناوەکان بنووسێت و ڕستەکە تەواو بکات، ئافەرینی دایە و بابە و مامۆستا وەردەگرێت.

.................. و.................. و .................. وەرن .

ـ لەم سێ خشتەی خوارەوە دا سێ وشە نووسراوە. ئەم سێ وشەیەمان لە دەرسەکانی پێشوو دا خوێندوون. کێ بتوانێ وشەکان لە ژێرەوەی خشتەکان بە چەشنێک دابنێت کە مانایەک بدەن و ببن بە ڕستەیەک، ئەو کەسە ئازایە و زانایە.

| داوی | ڕێوی | دیوە |
|---|---|---|

. (........................................)

ـ دایە ئەم ڕستانە خوارەوەی نووسیوە، بەڵام لە هەر ڕستەیەک دا وشەیەکی شاردۆتەوە، ئەوەی وشەکان بدۆزێتەوە و لەسەر جێی خۆیانیان دابنێتەوە، زۆر ئازایە و گەلێک زانایە.

مار بە ئاو دا ........................... .
ڕێوی داوی ............................ .
دایە بێستان .................. دەدا .
باران .............................. .
بابە سێ داران ئاو ................. .

ـ ئەم وشانە بخوێنەوە و بڵێ یەکەم پیتی سەرەتای هەر وشەیەک چییە .

نەسرین ـ نادر ـ نەرمین ـ ناری ـ وریا ـ ئاوات ـ ئارام ـ ئاران ـ سارم ـ سەیوان ـ ساوان ـ بەرد ـ دار ـ
ئاو ـ ڕێوی ـ ڕاو ـ ڕێ ـ ڕێواس ـ ڕامان ـ مەریوان ـ ماسی ـ مار ـ مام بارام ـ بابە ـ دایە ـ برا ـ بەبە ـ
بێستان ـ دارستان ـ سارا ـ سەر ـ سیر ـ سەرما ـ تارا ـ تەوار ـ تار ـ تەماتە ـ ئارد ـ



ـ ئەم پیتانەی خوارەوە بخوێنەوە و ناو زگیان بە قەڵەمەکەت ڕەش بکەوە:

تـ ت بـ ب د ر

مـ م سـ س ئـ

یـ ی نـ ن و ڕ

---





شەو



مێش



شەش مێش



**شادان و ماشێن**



**شادان و شەش ماشێن**



**شەش بەرد و شەش بادام**



**شێروان برای شەمێ یە.**

**شێروان برای شادانە.**

**شێروان و شەمێ و شادان شادن .**

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : ئەم دوو دەنگانەی ژێرەوەمان لە دوو دەرسی پێشوو دا خوێندووە:

( ســ - س )　　　　　　　　( شــ - ش )

ئێستا سەیری ئەم وشانەی ژێرەوە بکە . هەر وشەیەک کە بە دەنگی (ســ) دەست پێ دەکات ، لە ژێر دەنگی (ســ ) دا بینووسە و هەر وشەیەکیش کە بە دەنگی (شــ) دەست پێ دەکات ، لە ژێر دەنگی (شــ) دا بینووسە. وشەکان ئەمانەن:

شادان ــ سارد ــ سارا ــ شەو ــ شار ــ سەر ــ شەش ــ ساوان ــ شان ــ سەما ــ

| | ســ | شــ |
|---|---|---|
| 1 | ........................... | ............................... |
| 2 | ........................... | ............................... |
| 3 | ........................... | ............................... |
| 4 | ............................. | .............................. |
| 5 | ............................ | ............................... |

---

– ئەم دوو ڕستەیە بخوێنەوە و بزانە ڕستەکان ڕاستن یان هەڵەن. ئەگەر پێت وایە هەڵەن ، ڕاستەکەیان لە ژێرەوەیان دا بنووسەوە:

1 شێروان برای مام بارامە .　　　　　2 ڕێوی داوی نەدیوە .

1.........................................　　　　　2..............................................

– سێ وشان لە ژێرەوە بنووسە ، کە بە پیتی ( د ) دەستپێکرابێت:

1 ..........................　　2 .............................　　3 ................................

- لە ژێرەوە دا دوو پیتمان پێکەوە گرێ داون، تۆیش هەر دووکیان پێکەوە بخوێنەوە:

| پیتی 1 | پیتی2 | پیتی 1 و 2 پێکەوە |
|---|---|---|
| ئـ | ا | ئا |
| تـ | ا | تا |
| ڕ | ا | ڕا |
| ر | ا | را |
| نـ | ا | نا |
| د | ا | دا |
| و | ا | وا |
| سـ | ا | سا |
| شـ | ا | شا |
| مـ | ا | ما |

- لە ژێرەوە دا دوو پیتمان پێکەوە گرێ داون، تۆیش هەر دووکیان پێکەوە بخوێنەوە:

| پیتی 1 | پیتی 2 | پیتی 1 و 2 پێکەوە |
|---|---|---|
| ئـ | ە | ئە |
| تـ | ە | تە |
| ڕ | ە | ڕە |
| د | ە | دە |
| ر | ە | رە |
| مـ | ە | مە |
| نـ | ە | نە |
| و | ە | وە |
| سـ | ە | سە |
| شـ | ە | شە |

جامی وەرە ئاو بەرە .

جامی وەرە نان بەرە .





جوانە من نایەم !

جوانە من نانی ساج نابەم .

نانی ساج ڕەشە .

بابە نانی ڕەشی ناوێ .



نانی ساج ڕەشە .

بابە نانی ساجی ناوێ.

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا: خشتە باتاڵەکان بە پیتی پێویست پڕ کەوە:

1 ـ برای شادی و شەمێ یە .

2 ـ برای جوانەیە .

3 ـ نانی ساجی ناوێ .

| ن | ا | و | ر | ێـ | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | ی | مـ | ا | |
| | | | بـ | ا | بـ |

ـ ئەم دوو وشەیە بخوێنەوە :

مار

ماسی

ـ ئەگەر ئەم دوو وشەیە لێک گرێ بدەی ، وشەیەکی تازەیان لێ ساز دەبێت.

مار ....................... ماسی

مارماسی

ـ ئەم دوو وشەیەش بخوێنەوە:

ئاو

دار

هەر ئەو جۆرەی کە دوو وشەی (مار) و ( ماسی ) بوون بە (مارماسی) ، دوو وشەی (ئاو) و (دار)یش پێکەوە دەبن بە (ئاودار).

ترێ ئاودارە . سێو ئاودارە. تۆیش چەند میوەی ئاودار بۆ مامۆستا بڵێ.

ـ ئەم ڕستەی خوارەوە وشەیەکی گرینگی لێ داکەوتووە، ئەگەر تۆ بتوانی وشەکە بدۆزیتەوە و ڕستەکە تەواو بکەیت، زانا و ئازی .

بابە نانی ڕەشی ................... .

ـ ئەوە چییە ؟

1ـ ئەگەر توونیمان دەبێت ، دەیخۆینەوە : .............................

2 ـ ئەگەر برسیمان دەبێت، دەیخۆین : ..............................

ـ پیتی ئاخری ئەم وشانەی خوارەوە بڵێ:

سێو ـ سارا ـ ڕێواس ـ ترێ ـ دەرمان ـ سارد ـ ساج ـ باج ـ مێش ـ شەش ـ ئاوات ـ ئەرەس ـ باران ـ جوان ـ جوانە ـ جار ـ

ـ لەم پیتانەی خوارەوە دا کێهەیان دەناسی ، بە قەڵەمەکەت ڕەشی بکەوە.






چاو          چاو



چرا



چوار چرا



چوار شەوە چیمەن چاوی دێشێ.

مام  جەواد بابی چیمەنە.

مام جەواد چەوەندەر ئاو دەدا.

بابی چیمەن چەوەندەر بە ئاوی چەم ئاو دەدا.

چەوەندەر ئاوی نەبێ،  چرچ دەبێ.

چیمەن چاوی دێشێ و ناسرەوێ.

چاوی چیمەن بە ماچ باش نابێ.

چاوی چیمەن دەرمانی دەوێ.



مام جەواد چەوەندەر ئاو دەدا.      مام جەواد چەوەندەر بە ئاوی چەم ئاو دەدا.



چیمەن چاوی دێشێ و دەرمانی دەوێ.

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

**مامۆستا** : ئەم ڕستەیە بخوێنەوە :

شێروان برای شەمێ یە .

ئەمجار بڕوانە دوو ڕستەی خوارەوە:

مام جەواد بابی چیمەنە . مام بارام مامی ئارامە .

ئێستا تۆیش جێی باتاڵی ئەم دووڕستانە بە دوو وشەی بەرامبەریان پڕ کەوە:

ئازاد برای ...................... .            بێری

ئاوات برای ...................... .            تەوار

ـ ئەم وشانەی خوارەوە بخوێنەوە و بڵێ دەنگی یەکەمیان چییە :

شادی ـ شاد ـ شادان ـ شار ـ شەڕ ـ شەمێ ـ شەش ـ

ـ پرسیار :

1 ـ دەنگی یەکەمی هەموو وشەکانی سەرەوە چی بوو ؟

2 ـ ئایا دەنگی یەکەمی وشەکانی سەرەوە ، بە تیپی گەورەی (ش) دەست پێکراون یان بە تیپی (شـ)بچووک ؟

ـ تیپی گەورەی (ش)

ـ تیپی بچکۆلەی (شـ )

ـ بۆ زانین :

ئەگەر زمانی کوردی بە خەتی لاتینی بنووسین، تیپی گەورەی پیتەکان لە سەرەتای وشە دا دێن، بەڵام بەم خەتەی کە ئێستا پێی دەنووسین، شکڵی گەورەی پیتەکان قەت لە سەرەتای وشەدا نایەن و وشەکان هەمیشە بە تیپی بچکۆڵە دەست پێ دەکرێن.

---

ـ سێ ڕستەی خوارەوە بخوێنەوە. لە سێ ڕستەکاندا هەر بەس یەکیان ڕاستە و ئەوانی تر هەڵەن. کێ بتوانێ لە بەرامبەر ڕستەی ڕاست دا ئەم نیشانەی(+) دابنێ، ئافەرین وەردەگرێت.

بەرد ئاوی دەوێ . ....................

ئاسن ئاوی دەوێ. .....................

دار ئاوی دەوێ. ......................

ـ لە نێو خشتەکانی ژێرەوەدا ناوی دوو گیاندار نووسراوە، بەڵام دەنگی یەکەمی هەر دووک گیاندارەکان لە خشتەی یەکەمدا داکەوتووە. کێ بتوانێ ئەو پیتە بدۆزێتەوە و ناوی دوو گیاندارەکەمان بۆ بخوێنێتەوە، ئافەرینێک وەردەگرێت.

| ی | سـ | ا | مـ | ر | ا | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | ا |
| | | | | | | ر |

مار ـ مارماسی

---

ـ سامان ئەم چەند ڕستەی خوارەوەی نووسیوە ، بەڵام لە هەر ڕستەیەکدا وشەیەکی بیر کردووە.

وشەبیرکراوەکانیش لە خوارەوە هاتوون ، سامان گەلێکتان سپاس دەکات ئەگەر وشەکان لە ڕستەکاندا جێ بدەنەوە و ڕستەکانی بۆ تەواو بکەنەوە.

1 ـ ڕێوی داوی ............... .

2 ـ ئاوات ئاو ................. .

3 ـ تارا و ئاوات و تەوار ئاو ................. .

4 ـ دایە سێ ................. ئاو دەدا .

5 ـ بابە دار ............... دەدا .

| دێنێ | دیوە | دێنن | داران | ئاو |
|---|---|---|---|---|



دۆ



مۆره



نۆ ماسی



نۆ مۆره



مام ئۆمەر                    سۆران



سۆران سەری دێشێ.



سۆران سەری دێشێ.

نۆ شەوە سۆران سەری دێشێ.

مام ئۆمەر دێ .

مام ئۆمەر برای بابی سۆرانە.

مام ئۆمەر دەرمان دەدا بە سۆران.

دەرمانی مام ئۆمەر بۆ سەرئێشە باشە.

دەرمانی مام ئۆمەر بۆ چاوئێشە نابێ.

سەری سۆران بە دەرمانی مام ئۆمەر ئێشی نامێنێ.

شادی دۆ دێنێ .

شادی بۆ مام ئۆمەر دۆ دێنێ.

دۆی شادی بۆ مام ئۆمەر باشە.



**شادی**

**شادی دۆ دێنێ .**

**دۆی شادی ترشه.**

**دۆی ترش بۆ مام ئۆمەر باشه.**

**مام ئۆمەر مامی شادی و سۆرانه.**

---

**باش ـ باشه ـ باش دەبێ ـ باش نابێ**

**ترش ـ ترشه ـ ترش دەبێ ـ ترش نابێ**

**چاوئێشه ـ چاوم دێشێ ـ چاوم نائێشێ**

**سەرئێشه ـ سەرم دێشێ ـ سەرم نائێشێ**

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

**مامۆستا** : ئەم دوو ڕستەی خوارەوە بخوێنەوە :

**مام ئۆمەر مامی شادی و سۆرانە.**

**مام جەواد بابی چیمەنە . مام بارام مامی ئارامە .**

**ـ ئەم ڕستەیە بخوێنەوە:**

**ئاوات و ناسر بران .**

**ـ ئێستا تۆ جێی بەتاڵی ئەم دوو ڕستەی خوارەوە بەم دوو ناوەی بەرامبەریان پڕ کەوە:**

**ئاوات برای ...................... .** ناسر

**ناسر برای ...................... .** ئاوات

**ـ ئەم وشانەی خوارەوە بخوێنەوە و بڵێ دەنگی یەکەمیان چییە :**

| 1 | 2 | 3 |
|---|---|---|
| شادی | سارد | بەرد |
| شاد | سەر | باران |
| شادان | سی | برا |
| شار | سەرما | باب |
| شەڕ | ساوان | بێری |
| شەمێ | سەما | بۆر |
| شەش | سۆما | بەبە |

ـ دەگەڵ برادەری پەنا باڵت دوو بە دوو دانیشن . تۆ وشەکانی بەری (1) بۆ ئەو بخوێنەوە و بڵێ کە پیتی یەکەمیان چییە. ئەمجار برادەرەکەت بەری (2) بۆ تۆ دەخوێنێتەوە و پیتی یەکەمی وشەکانت بۆ دەڵێ.

| (1) | | (2) |
|---|---|---|
| باب | | مام |
| برا | | چرا |
| سەر | | دەست |
| جەواد | | ئازاد |
| نان | | ئاو |
| ئۆمەر | | دۆ |
| سارم | | بارام |
| سۆران | | ساوان |
| ڕێوی | | ڕاو |
| بێری | | شەمێ |
| شاد | | شادان |

# (دەرسی هەژدە)

وو

وو وو وو وو وو وو

دوو ڕوو موو سوو شوو بوو ئوو توو نوو جوو چوو



**سێوی سوور**



**دوو سێوی سوور**



**دوو ئەستێرەی سوور**



**شووتی**



**سەبری چاوی دێشێ**

**سەبری چاوی دێشێ.**

**چوار شەوە چاوی سەبری سوور دەبێ و دێشێ.**



**مامەندە سوور بابی سەبری یە.**

**مامەندە سوور بۆ دەرمان دەچێتە شار.**

**شار دوورە .**

**مامەندە سوور  بە ماشێن دەچێتە شار.**



**بابی سەبری دوو دەرمانان دێنێ، دەرمانی چاوان و دەرمانی مووی سەر.**

**مووی سەری بابی سەبری دەوەرێ.**

**مامەندە سوور دەرمانی مووی سەر و دەرمانی چاوان دێنێ .**



**کەو**



**کۆتر**



**کتێب**





کاک سامی                    کانی

کاک سامی ڕاوی کەو دەکا.

کاک سامی داو دادەنێ و کەو دە داو دەکەوێ.

دەندووکی کەو سوور و جوانە.



کانی کچی کاک سامی یە.

کانی داوی کەو دەبا بۆ کێو .

کانی نان و ئاو دەبا بۆباوکی.

ئێواران کانی و باوکی دێنەوە دێ.







کێو

کانی نان دەبا بۆ کێو .

کانی ئاو دەبا بۆ کێو .

کانی داوی کەو دەبا بۆ کێو.

کانی نان و ئاو و داوی کەو دەبا بۆ کێو.





کانی نان دەبا بۆ باوکی .

کانی ئاو دەبا بۆ باوکی.

کانی داوی کەو دەبا بۆ باوکی.

کانی نان و ئاو و داوی کەو دەبا بۆ باوکی.

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : ئەم پیتانەی ژێروەمان خوێندوون. ئەم پیتانە فۆرمی گەورە و بچووکیان هەیە . بەڵام بەشێک لەو پیتانەی کە خوێندوومانن، هەر بەس یەک فۆرمیان هەیە و گەورە و بچووکیان نییە. سەیری خوارەوە بکە و ببینە !

| بچووک | گەورە |
|---|---|
| بـ | ب |
| تـ | ت |
| نـ | ن |
| مـ | م |
| کـ | ک |
| سـ | س |
| شـ | ش |
| ێـ | ێ |
| یـ | ی |
| جـ | ج |
| چـ | چ |

| ئەم پیتانە هەر بەس یەک فۆرمیان هەیە. |
|---|
| ئـ |
| ا |
| د |
| و |
| ۆ |
| وو |
| ر |
| ڕ |

– سەیری فۆڕمی بچووکی پیتەکانی ژێروو بکە:

بـ تـ نـ مـ کـ شـ یـ ێـ جـ چـ

ئەمجار سەیری فۆڕمی گەورەی هەر ئەو پیتانەی سەرەوەش بکە :

ب ت ن م ک ش ی ێ ج چ

دوو فۆڕمی گەورە و بچووکی پیتەکانی سەرەوە لە سەر خەتێک نووسراون، کە ئێمە بەم خەتانە دەڵێین:(خەتی زەمینە).

هەروەکی دەیبینن ، تیپی بچووکی پیتەکان کلکدارن و کلکیان لە سەر خەتی زەمینە ڕاکشاوە. بەڵام تیپی گەورەی پیتەکان بێ کلکن و لە سەر خەتی زەمینە ڕانەکشاون.

هەر پیتێک کە کلکدار بێ و کلکی لە سەر خەتی زەمینە ڕاکشابێت، ئەو توانایەی هەیە کە لە هەر دوو سەرانەوە بە پیتی دیکەوە بلکێت.

بۆ وێنە سەیری ئەم چەند ڕستەیەی خوارەوە بکە. لە ڕستەکاندا ئەو پیتانەی کە بە ڕەنگی سوور نووسراون، تیپی بچووکن و کلکیان کەوتۆتە سەر خەتی زەمینە . هەر وەکی گوتمان هەر پیتێکی کە کلکدار بێ و کلکی لە سەر خەتی زەمینە ڕاکشابێ، ئەو توانایەی هەیە کە لە هەر دوو سەرانەوە( لە پێش و لە پاشەوە) بە پیتی دیکەوە بلکێت.

کانـی نان و ئاو و داوی کەو دەبا بۆ کێو.

دایە بێستان ئاو دەدا.

چیمەن چاوی دێشێ .

دۆی ترش بۆ مام ئۆمەر باشە.

مام ئۆمەر برای بابـی سۆرانە.

– ئێستا سەیری فۆڕمی ئەم پیتە گەورانەی ژێرەوە بکە:

( ا ی ر ز وو ە د و )

– پرسیار : ئایا ئەم پیتانەی سەرەوە کلکدارن و کلکیان لە سەر خەتی زەمینە ڕاکشاوە؟

وەڵام : نەخێر کلکدار نین و کلکیان لەسەر خەتی زەمینە ڕانەکشاوە.

ئێستا هەر ئەم پیتانە لە ڕستەی خوارەوە دا ببینن:

کا نـی کراسی سوور دەبەر دەکا.

کاک کاوە ڕاوی کەو ناکا .

– لە دوو ڕستەی سەرەوەدا ، هەموو ئەو پیتانەی کە بە ڕەنگی سوور نیشان دراون ، بێ کلکن و هەر بۆیە ، یان بە تەنیا لە وشە دا هاتوون ، یان پیتێکی کلکداریان پێوە لکاوە.

**– پرسیار و وەڵام:**

1 ـ **کێ ڕاوی کەو دەکا ؟**

2 ـ **کێ داو دا دەنێ ؟**

3 ـ **کێ نان و ئاو و، داوی کەو دەبا بۆ کێو ؟**

4 ـ **بە بڕوای تۆ ، کانی زیاتر کار دەکا یان باوکی ؟**

5 ـ **کەو لە کوێ دەژی ؟**

6 ـ **ئایا ئێوە قەت کەوتان بینیوە ؟**

7 ـ **ئایا ئێوە قەت کۆترتان بینیوە ؟**

8 ـ **کەروێشک چی دەخوا ؟**

9 ـ **ئێمە چی دەخۆین ؟**

10 ـ **بەرد چی دەخوا ؟**

11 ـ **من ناوی ئەم چەند شتانە دەڵێم ، ئەوەی کە ئاو دەخوا ، بڵێ (ئا) و کێهەیان ئاو ناخوا بڵێ (نا)!**

**کەو کۆتر کەروێشک بابە بەرد ئاسن دایە کتێب کەر درگا چرا سەگ پشیلە ماشێن ئەسپ کەوش(پێڵاو) کراس چۆلەکە مامۆستا قەڵەم ئاوات ڕێوی**

- شەمێ ئەم چەند ڕستەی ژێرەوەی نووسیوە، بەڵام بۆ تاقیکردنەوەی ئێوە، چەند وشەی لە ڕستەکان دا شاردۆتەوە، کێ بتوانێ وشەکان بدۆزێتەوە و لەسەر جێی خۆیانیان دابنێتەوە،زانا و ئازایە .

کاک سامی ڕاوی کەو ......................... .

دەندووکی .................... سوور و جوانە.

کانی نان و ئاو و، ....................... دەبا بۆ کێو.

کاک سامی داو دادەنێ و کەو دە داو ............... .

چەوەندەر ئاوی نەبێ ، چرچ ........................ .

چوار شەوە چاوی سەبری سوور دەبێ و .................... .





کاک سامی                                    کاک مەریوان

کاک مەریوان و کاک سامی بران.

کاک مەریوان ڕاو دەکا. کاک مەریوان ڕاوی ڕێوی دەکا.

کاک مەریوان بۆ ڕاوی ڕێوی دەچێتە کێو. شەوانە کێو تاریک دەبێ .

گورگ بۆن دەکا و بۆ کاک مەریوان دێ.

کاک مەریوان ئاگر دەکاتەوە. گڕی ئاگر ، گورگ دەترسێنێ .

سەگی کاک مەریوان بە گورگ دەوەڕێ.

گورگ ناوێرێ بۆ کاک مەریوان بێ.

سەگی کاک مەریوان دڕە.





**مام دومان باوکی سامانە. مام دومان و سامان کوردن. مام دومان و کوڕەکەی کوردی کرمانجن. سۆما برادۆست شوێنی دانیشتنی کوردی کرمانجە. مام دومان و سامان نیشتەجێی گوندی (کوڕانە)ن. کوڕانە گوندێکی سۆما برادۆستە. سۆمابرادۆست سەرووی کوردستانی ئێرانە. مام دومان و کاک سامان دارتاشن. ئەوان دەرکە و کورسی دروست دەکەن.**

---

مامۆستای هێژا! پیتی(و)، پیتێکی (ڤۆکال)دەنگبزوێنە و دەگەڵ پیتی چەقیوی(و)، کە لە دەرسەکانی پێشوو دا خوێندمانن، جیاوازە. جیاوازیی (و)ی دەنگبزوێن دەگەڵ (و)ی چەقیو ئەمەیە کە :

1ـ لە نووسینی کوردی (بەم خەتەی کە ئێستا پێی دەنووسین)، دەنگبزوێنەکان قەت لە سەرەتای وشە دا نایەن.

2ـ هیچ دوو دەنگبزوێنێک شان بەشانی یەک و پێکەوە لە یەک وشە دا نایەن. ئەم پیتەی کە لەم دەرسە دا هاتووە، پیتی دەنگبزوێنە و ئەم دوو تایبەتمەندییەی کە بۆ پیتی دەنگبزوێن گوتمان ، هەیەتی.



دارتاش







دەرکە(درگا) کورسی

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

**مامۆستا** : ئەم دوو وشەیە پێکەوە بلێین :

ماسی ............................ گر

ماسیـ ............................ گر

ماسیگر

وشەی لێکدراوی ( ماسیگر) بۆ کەسێک یان بۆ باڵندەیەک دەکار دەکرێت ، کە ماسی بگرێت.

---

ـ ئەم دوو ڕستەیە بخوێنەوە :

مووی سەری مامەندە سوور دەورەی .

سەگی کاک مەریوان دەوەڕێ.

لەم دوو ڕستەیەدا دوو وشەی ( دەوەرێ) و ( دەوەڕێ) بە ڕەنگی سوور نووسراون.

مانای ئەم دوو وشەیە گەلێک لە یەک دوورن ، بەڵام لە نووسێن دا وەکی یەک دەنووسرێن و هەربەس یەک جیاوازییان هەیە. لە ژێرەوە سەیری جیاوازییەکە بکە و بڵێ ئەم جیاوازییە چییە.

(دەوەرێ ) ⟷ ( دەوەڕێ )

ـ ئەم دوو ڕستەیە بخوێنەوە :

1 ـ سێوی سەر داران بە بای توند دەوەرن .

2 ـ سەگەکانی دێ بە گورگی کێوی دەوەڕن.

**- پرسیار و وەڵام:**

1 ـ مامەندە سوور بۆ کڕینی چ دەرمانێک بۆ شار چوو؟

2 ـ کاک سامی ڕاوی کەو دەکا ، ئەدی کانی چ دەکا ؟

3 ـ پیتی یەکەمی سێ وشەی (کۆتر)، ( کەو ) و ( کەروێشک)، چییە ؟

4 ـ کاک مەریوان لە کێو ڕاوی چی دەکا ؟

5 ـ شەوانە کە کێو تاریک دەبێ، چ جانەوەرێک بۆ کاک مەریوان دێتە پێش ؟

6 ـ سەگی کاک مەریوان شەوانە بۆچ دەوەڕێ ؟

7 ـ مووی سەری بابی سەبری دەوەرێ، ئەدی سەگی کاک مەریوان ئەگەر گورگ دەبینێ، چی دەکا؟

8 ـ گورگ بۆچی لە کاک مەریوان نایەتە پێش ؟

---





**سەگی گەزیزە بە گورگەکان دەوەڕێ .**



وەستا مارف                                    فەرید

وەستا مارف ئاسنگەرە. ئاسنگەری کارێکی گرانە.

فەرید شاگردی وەستا مارفە.

فەرید کورەدەمێنە. کورەدەماندن کارێکی گرانە.

فەرید ئاگری کورە دەدەمێنێ و وەستا مارف کوتک دەوەشێنێ.

فەرید و وەستا مارف کرێکارن. دەسترەنجی فەرید و وەستا مارف کەمە.

وەستا مارف جار جار ماندوو دەبێ و کوتک دەدا بە فەرید.

فەرید کەم کەمە فێری کوتک وەشاندن دەبێ.

وەستا مارف ئێواران ماف دەدا بە فەرید.

فەریدە کچی وەستا مارفە .



ئاسنگەر



کوتک و دەزگای ئاسنگەری



کورەی ئاسنگەری



کوتکی ئاسنگەری

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : سەیری ئەم وشە لێکدراوانەی خوارەوە بکە :

کرێـ + کار = کرێکار

ئاسنـ + گەر = ئاسنگەر

دەستـ + ڕەنج = دەستڕەنج

ـ پێشەکی ئەم دوو وشەیە بخوێنەوە و لە دوایەش هەر ئەم وشانە لە ڕستەکانی خوارووتر دا ببینە:

ماندوو = شەکەت

وەستا مارف جار جار ماندوو دەبێ .

وەستا مارف جار جار شەکەت دەبێ.

دوو وشەی ( ماندوو) و ( شەکەت) ، دوو وشەی هاومانان. لەم کتێبەدا ، ئەم نیشانەیە(=) لە نێوانی چەند وشە دا ببینی ، بزانە کە هەموو وشەکان هاومانای یەکن.

لە زمانی کوردیدا وشەی هاومانانامان زۆرن. جاری وا هەیە لە نووسینێکدا چەندین وشەی هاومانا دەکار دەکرێت. کەسێک کە وشەی هاومانای زمانی شیرینی کوردی زیاتر بزانێت ، دەتوانێ باشتر بنووسێت و باشتر قسەی پێ بکات.

ـ ئێستا سەیری ئەم سێ وشەیە بکە و لە دوایەش ئەم سێ وشەیە لە ڕستەکاندا ببینە.

چۆم = چەم = ڕووبار

کاک ئارام بۆ ماسی گرتن دەچێتە دەم چۆم.

کاک ئارام بۆ ماسی گرتن دەچێتە دەم چەم.

کاک ئارام بۆ ماسی گرتن دەچێتە دەم ڕووبار.

ـ ئەم دوو وشەیە لە دوو ڕستەی خوارووتر دا ببینە .

باش = چاک

چاوی چیمەن بە دەرمان باش دەبێتەوە .

چاوی چیمەن بە دەرمان چاک دەبێتەوە.

ـ ئێستا ئەم دوو وشەیە لە دوو ڕستەی خوارووتر دا ببینە .

گران # سووک

ئاسنگەری کارێکی گرانە .

دانیشتن کارێکی سووکە .

وشەی (گران) و وشەی ( سووک) هاومانا نین . ئەم دوو وشەیە ماناکەیان دژی یەکە و هەر بۆیە بەمجۆرە وشانە دەڵێن : وشەی دژمانا.

**لە نێوانی دوو وشەی دژماناندا ئەم نیشانەیە دادەنێین: ( # ).**

**ئێستا من چەند وشەیەک دەڵێم و ئێوەیش دژماناکەی هەر بەس بە زمان بڵێن :**

1 ـ دوور

2 ـ کەم

3 ـ تاریک

4 ـ شەو

5 ـ سووک

6 ـ ڕەش

7 ـ دەر

8 ـ سارد

9 ـ تەڕ

10 ـ نەرم



سارا تاقانه کچی داده سەبری یە.

داده سەبری دوێنێ بۆقێکی بۆ سارا کڕی.

قادر و قاسم لە دوورەوە دێن.

قادر و قاسم بۆقی سارا دەبەن و دەڕۆن.

سارا دەگری.

داده سەبری بانگی قادر و قاسم دەکا :

ـ کوڕە قادر و قاسم وەرن وەگەڕێن !

ـ قادر و قاسم بۆقی کچی من مەبەن !

ـ قادر و قاسم بۆقی کچی من بدەنەوە!



سارا بۆ بۆقەکەی دەگری .

سارا بانگی دایکی دەکا:

ـ دایە وەرە !

ـ دایە گیان وەرە !

ـ قادر و قاسم بۆقەکەیان بردم !

ـ دایە بگەیە بۆقەکەم چوو !







کورە قادر و قاسم بۆقی کچی من مەبەن !

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

**ـ پرسیار و وەڵام .**

1 ـ کاک مەریوان بۆچی شەو لە شاخ دەمێنێتەوە؟

2 ـ ئایا ئێوە قەت کێوتان لە نزیکەوە بینیوە ؟

3 ـ گورگ لە کێو دەژی و سەگ لە نێو ماڵانە و دەگەڵ خەڵکە، بە بڕوای ئێوە ژیانی کێهەیان ئازاد و سەربەست و خۆشترە؟

4 ـ گورگ لە کێو دەژی، ئێوەیش ناوی سێ زیندەوەران بڵێن کە لە کێو دەژین.

5 ـ وەستا مارف جارجار ماندوو دەبێ، ئەرێ ئێوەیش جار جار شەکەت دەبن؟

6 ـ وەستا مارف و فەرید چکارەن و چ پیشەیەکیان هەیە ؟

7 ـ سارا تاقانەی دادە سەبری یە، ئێوە کەس دەناسن تاقانەی دایک و باوکی خۆی بێ؟

8 ـ کچی وەستا مارف نێوی چی یە؟

9 ـ ئەودەم کە قادر و قاسم بۆقی (سارا)یان برد، سارا بانگی کێی کرد و گوتی چی؟

10 ـ دادە سەبری بانگی (قادر) و (قاسم)ی کرد ، چی پێ گوتن؟

---

ـ هەرچی زیندووە ، پێی دەگوترێ (زیندەوەر).

زیندەوەرەکان بۆ زیندوومانیان دەبێ بخۆن، هەناسە بکێشن و بخەون.

زیندەوەرەکان بۆ وەدەست هێنانی خواردن و خواردنەوە و جێ خەوی باش، دەبێ بجووڵێنەوە و بە شوێنیان دا بگەڕێن.

ماسی زیندەوەرێکە لە ئاو دا دەژی. خواردنی خۆی لە نێو ئاو دا دەدۆزێتەوە و دەیخوا، لە ئاو دا هەناسە دەکێشێ و لە ئاودا دەخەوێ. ئەگەر ماسی لە ئاو بێتەدەر، دەمرێ.

---

- ئەمانەی ژێرەوە هەموویان گیانلەبەرن. ئێوە بەس ناوەکەیان بڵێن و ئەگەر گیانلەبەرانی تریش دەناسن نێوەکەیان بڵێن.



- جگە لە مانەی سەرەوە، لە خوارەوەش گیان لەبەرانێک دەبینن کە وەکی ئەوانەی سەرەوە دەژین. ئەوانە دار و گیا و گوڵەکانن .









**شاری سەقز**

**سەقز شارێکی مەزنی کوردانە.**

**سەقز شارێکی ڕازاوە و ڕەنگین و جوانە.**

**ئاوی شاری سەقز سارد و سووکە.**

**سەقزی زانا و ئازا و میوان نەوازن.**

**زارا و زیبا دوو کچە سەقزین. زارا و زیبا ئامۆزان. زارا و زیبا زانا و زیرەکن. دایکی زیبا دوو گوارەی زێڕی بۆ زارا کڕی. دایکی زارا دوو گوارەی زێوی بۆ زیبا کڕی .**

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی



جووتێک گوارەی زێڕ



جووتێک گوارەی زێو

دوو گوارەی زێڕ = جووتێک گوارەی زێڕ

دوو گوارەی زێو = جووتێک گوارەی زێو



دوو کۆتر



جووتێک کۆتر



دوو گا



جووتێک گا

ـ لەم لاپەڕەیە دا دوو وشەی : ( دوو ) و ( جووتێک ) لە بەرامبەری یەکدان و بە ڕەنگی سووریش نووسراون، ئەمە بەم مانایەیە کە ئەم دوو وشەیە مانایان وەکی یەکە.

**ئێوەیش لە خوارەوە ، ئەم دوو وشەیە دەکار بکەن:** **(دوو)** **( جووتێک)**



**......................... کەو**



**...................... کەو**



**......................... مراوی**



**......................... مراوی**



**......................... گۆرەوی**



**......................... گۆرەوی**



**......................... کەوش**



**......................... کەوش**

**ئامۆزا = کچە مام و کوڕە مام**

**زارا و زیبا ئامۆزان = زارا و زیبا کچە مامن = ( زارا و زیبا کچی مامی یەکترن)**

**ڕێبەر و ساکۆ ئامۆزان = ڕێبەر و ساکۆ کوڕە مامن = ( ڕێبەر و ساکۆ کوڕی مامی یەکترن)**

---

**- پرسیار و وەڵام:**

**1 ـ لە دەرسی پێشین دا ، بە خەڵکی کێهە شاری کوردستان گوترا: زانا و ئازا و میوان نەواز؟**

**2 ـ چاوێک بە نەخشەی خوارەوە دا بگێڕن و بە یارمەتیی مامۆستا و دایە و بابە ، ئەم پرسیارانە وەڵام بدەنەوە:**

**ئا ـ دوو شاری مەزنی دراوسێی شاری سەقز بدۆزنەوە و ناویان بەرن.**

**ب ـ ئێمە بە خەڵکی شاری سەقز دەڵێین :(( سەقزی)) . ئەدی بە خەڵکی شاری سنە و بۆکان چ بڵێین؟**

**3 ـ دایکی زارا و دایکی زیبا چ شتێکیان بۆ کچانی یەکتر کڕی؟**

**4 ـ ئەگەر دایکی ڕێبەر و دایکی ساکۆ شتێک بۆ کوڕانی یەکتر بکڕن ، بڵێی گوارەیان بۆ بکڕن؟**

**5 ـ بە بڕوای ئێوە ، دایکی ساکۆ و دایکی ڕێبەر دەبێ چ شتێک بۆ کوڕانی یەکتر بکڕن؟**

---



ـ لە ڕستەی خوارەوە دا ناوی دوو باڵندە هاتوون کە لە دەرسەکانی پێشوو دا خوێندوومانن.ناوی ئەم دوو باڵندەیە لە خشتەکانی ژێرەوە دا نووسراون ، بەڵام پیتی یەکەمی هەر دووکیان داکەوتووە.
ڕستەکە باش بخوێنەوە و باڵندەکان بناسە و پیتە داکەوتووەکە لە سەر جێی خۆی دابنێوە.

کێوەکانی شاری سەقز ، کەو و کۆتریان زۆرە.

| ر | تـ | ۆ | |
|---|---|---|---|
| | | | ـە |
| | | | و |
| | | | |





**داده ڕۆژین و کاک سامان**

**داده ڕۆژین و کاک سامان ژن و مێردن. کاک سامان مێردی داده ڕۆژینه. داده ڕۆژین و کاک سامان مامۆستای فێرگەن. فێرگەی داده ڕۆژین و کاک سامان نزیکه.**



کاژین کچی دادە ڕۆژین و کاک سامانە. ژیر کوڕی دادە ڕۆژین و کاک سامانە. کاژین کچێکی ڕووگەش و شادە. ژیر کوڕێکی دەم بەپێکەنینە. کاژین و ژیر ڕۆژانە پێکەوە کایە دەکەن.

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : چوار ڕستەکانی ژێرەوە بخوێننەوە و ئینجا ماڵی خشتە بەتاڵەکان بە پیتی پێویست پڕ کەنەوە.

1 ـ شارێکی مەزنی کوردستانە.

2 ـ شارێکی جیرانی شاری سەقزە.

3 ـ ناوی دایکی ژیرە.

4 ـ ناوی مێردی دادە ڕۆژینە.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ســ | ـە | | ز | |
| بـ | ۆ | | ا | ن |
| ڕ | ۆ | | یـ | ن |
| ســ | ا | مـ | ا | |

ژان دەکا = دێشێ

سۆران سەری ژان دەکا . = سۆران سەری دێشێ .

سەبری چاوی ژان دەکا. = سەبری چاوی دێشێ.

دادە ڕۆژین سەری ژان دەکا . دادە ڕۆژین سەری دێشێ.

دەبێ # نابێ

چاوی سەبری بە دەرمان باش دەبێ.

چاوی سەبری بە ماچ باش نابێ.

باشە # باش نییە

دۆی دادە بۆ مام ئۆمەر باشە.

دۆی دادە بۆ وەستا مارف باش نییە.

---

دەبا # نابا

کانی نان و ئاو بۆ باوکی دەبا .

کانی دەرمان بۆ باوکی نابا .

---

کەمە # کەم نییە

دەسترەنجی کرێکار کەمە .

داهاتی زۆردار کەم نییە.

---

ـ جێی بەتاڵی ڕستەکانی ژێروو بە پیتی پێویست پڕ کەنەوە:

1 ـ دایکی زیبا جووتێک گوارەی بۆ زارا .................... .

2 ـ سەقز شارێکی مەزنی .................... .

3 ـ فەرید ئاگری کورە .................... .

4 ـ وەستا مارف کوتک .................... .

5 ـ سارا بۆ .................... دەگری .

6 ـ قادر و قاسم بۆقی سارا دەبەن و .................... .

7 ـ کانی و باوکی ئێواران .................... دێ .

8 ـ دادە ڕۆژین دایکی کاژین و .................... .

ـ لە ژێرەوە، دوو ڕستە لە بەرامبەری یەكتر دا نووسراون. هەندێک لە دوو ڕستەكان هاومانان و هەندێكیان دژمانان. بۆ هاوماناكان ئەم نیشانەیە ( = ) و بۆ دژماناكان ئەم نیشانەیە ( # ) لە نێو كەوانەكان دا دابنێن.

1 ـ سارا و دارا دێن. (      )  سارا و دارا دەڕۆن.

2 ـ كاک سارم و مام بارام دار ئاو دەدەن. (      ) مام بارام و كاک سارم دار ئاو نادەدەن.

3 ـ چاوی سەبری ژان دەكا (   ) سەبری چاوی دێشێ .

4 ـ فەریدە نان و ئاو دێنێ (   ) فەرید نان و ئاو دەبا.

5 ـ بەژنی دارە چنار بەرزە (      ) بەژنی دارە سێو كورتە.

6 ـ فەریدكورە نادەمێنێ (      ) فەرید كورە دەدەمێنێ .

---

## میوە



ترێ میوەیە.

سێو میوەیە.

مۆز میوەیە.

ترێ و سێو و مۆز میوەن.



بەرخ



چەرخ



خۆخ



خەو



خوار



ڕاست

ساوان کچی خاوەرخان و کاک فەرخەیە.  ساوان ورد و نەرم و خوێن شیرینە. خاوەرخان و کاک فەرخە کچی خۆیان زۆر خۆش دەوێ. ساوان خۆشەویستی دایک و باوکە.



ساوان کچی خاوەرخان و کاک فەرخەیە.

خاوەرخان مامۆستای خوێندنگەیە. خوێندکارەکان مامۆستای خۆیان زۆر خۆش دەوێ. خوێندنگەی خاوەرخان نزیکە.



**کاک فەرخە دارتاش و وەستاکارە. کاک فەرخە چەرخە چەرخی گاریێ ساز دەکاتەوە.**
**کاک فەرخە ڕۆژانە سێ چەرخی گاریێ ساز دەکاتەوە. ڕێی گوندەکان بۆ شار زۆر باش نییە، بۆیە چەرخی گاریێ زۆر زوو دەشکێ.**





## خوێندنگە

خوێندنگە جێی خوێندنە.

کوڕ و کچەکان دەرس دەخوێنن.

کوڕ و کچەکان خوێندکارن.

خوێندکارەکان مامۆستای خۆیان زۆر خۆش دەوێ.

خاوەرخان مامۆستای خۆشەویستی خوێندکارەکانە.

خوێندنگەکەی خاوەرخان زۆر نزیکە.



**خاوەرخان و خوێندکارەکان خەریکی خوێندنن.**



**خوێندکارەکان کایە دەکەن.**



**کارگای دارتاشی**

**کارگا، شوێنی کارکردنە.**

**وەستا فەرخە دارتاشە.**

**ڕێگای گوندەکان ناخۆشە، بۆیە چەرخی گاریێ زۆر زوو دەشکێ.**

**وەستا فەرخە پیاوێکی ڕووخۆشە.**

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : لە نێوان دوو وشەی هاومانا دا ئەم نیشانەیە(=) و لە نێوانی دوو وشەی دژمانا دا ئەم نیشانەیە (#) دا بنێن.

شەو (      ) ڕۆژ

شاد (      ) ناشاد

خوار (      ) ڕاست

چاک (      ) باش

سارد (      ) گەرم

ڕەق (      ) نەرم

گوند (      ) دێ

دوور (      ) نزیک

ـ ئەم وشانە بخوێنەوە و بڵێ دەنگی ئاخریان چییە .

بەرخ خۆخ شاخ گوند دێ شار چەرخ ساوان خۆش خوێندن

نووسیــن قاقەز قاز ڕێوی کەروێشک کەوش گارێ دەنگ باران

ـ ڕستەیەکمان لە ژێرەوە نووسیوە و وشەکەنمان بە جۆرێک شێواندووە ، کە بۆ ساخ کردنەوەیان پێویستە کەمێک بیر بکەینەوە. ئێوەیش وشەکان بخوێننەوە و ئەگەر ڕستەکەتان بۆ ساخ کرایەوە، لە نێو کەوانەکەی خوارەوە دا بینووسنەوە.

چەرخی کاک ساز فەرخە گارێ دەکاتەوە .

( .......................................................................... . )

---

ئەم ڕستەیە بخوێنەوە : (( خوێندنگەی خاوەرخان زۆر دوور نی یە. ))

هەر ئەم ڕستەیە دیسان بخوێنەوە : (( خوێندنگەی خاوەرخان زۆر دوور نییە . ))

دەتوانین وشەی (( نی یە)) بەم دوو شێوەیە بنووسین. (( نی یە = نییە ))

کاک فەرخە بۆ گوندی یەکان کار دەکا. = کاک فەرخە بۆ گوندییەکان کار دەکا.

گوندی یەکان بە گارێ سەفەر دەکەن . گوندییەکان بە گارێ سەفەر دەکەن.

وشەی (گوندی یەکان)یش بە دوو جۆر دەنووسرێت.

(( گوندی یەکان = گوندییەکان))

---

**ـ پرسیار و وەڵام :**

**1 ـ گاریێ چەند چەرخی هەیە ؟**

**2 ـ دوو گاریێ ، یەکیان هیچ چەرخی پێوە نییە و ئەوی تریان هەر دووک چەرخی ساخە؛ بە بڕوای ئێوە کامیان باشتر دەڕوا؟**

**3 ـ قەڵەمەکەت لە سەر مێزەکەت دابنێ و پەنجەی دەستت بخە سەری و هەر وەک چەرخ بە سەر مێزەکە دا بیگەڕێنە ، ئێستا ڕاستە( خەت کێش)ەکەت بخە ژێر پەنجەی دەستت و هەر ئەم کارەی پێشوو بکە؛ کێهەیان باشتر دەڕوا؟**

**4 ـ لە ژێرەوە دوو تراکتۆران دەبینن؛ بە بڕوای ئێوە کامیان دەتوانێ بڕوات و کەمیان نا؟ بۆچی ؟**



**5 ـ پەتی دارە خڕەکەی ژێرەوە لە دەست سارا دایە و ڕایدەکێشێ و سەیوان پەتی تەختە پانەکە ، بە بڕوای ئێوە سارا توندتر دەڕوا ، یان سەیوان؟ بۆچی ؟**



6 ـ بەردێکی پان و مۆرەیەکی خڕ لە لێژایی هەوارزێک داندراوە، بە بڕوای تۆ کێهەیان توندتر دێتە خوار؟ بۆچی ؟



7 ـ شادی شەش ماشێنی هەیە، پێنجیان چەرخەکانیان شکاوە و هەر ماشێنێکیان چەرخی هەیە، ئەگەر شادی ماشێنەکان لە لێژایی سەر هەورازێکدا دابنێ، پێنج ماشێنە بێ چەرخەکان دەیبەنەوە یان ماشێنە چەرخدارەکە؟ بۆچی ؟

## بزنه ڕەش

عەزیز و سەعید بران. سەعید برا گەورەیە و عەزیز برا گچکەیە.

کاک عارف، باوکی سەعید و عەزیزە. کاک عارف بزنێکی ڕەشی بۆ کوڕانی خۆی کڕیوە.

بزنە ڕەش کەمێک ترسنۆکە . زۆر جاران باعە باع دەکا و ڕادەکا.

باعە باعی بزنە ڕەش زۆرجاران سەعید و عەزیزیش دەترسێنێ.

ڕۆژێک جووتەی برایان بزنە ڕەشیان بردە چۆم.



سەعید بزنە ڕەشی شورد .

عەزیز بزنە ڕەشی وشک کردەوە.

سەعید و عەزیز بۆ نان خواردن دانیشتن.

بزنە ڕەش زۆر توند باعاندی .

عەزیز ڕووی کردە سەعید و گوتی:

ـ ئەریێ عەزیز بڕۆ بزانە بزنە ڕەش بۆچی باعە باع دەکا؟

عەزیز گوتی:

ـ بزنە ڕەش چی نەدیوە کاکە سەعید. بزنە ڕەش ترسنۆکە و باعە باع دەکا.

سەعید گوتی:

ـ وانییە عەزیز... بڕۆ بزانە بزنە ڕەش چی دیوە و بۆچی باعە باع دەکا!



**عەزیز بۆ بزنە ڕەش چوو.**

**عەزیز بانگی کاکی کرد و گوتی:**

**ـ ئای !... وەرە کاکە سەعید!... وەرە بزنە ڕەشمان خورا!**

**وەرە کاکە سەعید... وەرە بزانە ئەم دەعبایە چییە؟**



سەعید خێرا بۆ بزنە ڕەش چوو.

سەعید چاوێکی گێڕا و بانگی عەزیزی کرد و گوتی:



ـ کوڕە عەزیز واز بێنە!... ئەم دەعبایە ژووژکە.

ژووژک دۆستی ئێمەیە و دوژمنی مارە.

عەزیز گوتی :

ـ ژووژک دۆستی ئێمەیە و بزنە ڕەشمان ناخوا؟

سەعید گوتی

ـ نا... نا ... عەزیزگیان ، ژووژک دەعبایەکی بەخێرە و زیانی بۆ ئێمە نییە.

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

**وشەی هاومانا :**

گەورە = مەزن

گچکە = بچووک

باوک = باب

ئاخر = دوایی

چۆم = چەم = ڕووبار

دۆست = یار

دوژمن = نەیار

دیتن = بینین

چی دیوە = چی بینیوە

دادە = دێدە

خوێندنگە = فێرگە = قوتابخانە

**وشەی دژمانا :**

گەورە # گچکە

بچووک # مەزن

دوور # نزیک

تاریک # ڕووناک

دوژمن # دۆست

شاد # ناشاد

خۆش # ناخۆش

ترسنۆک # نەترس

تەڕ # وشک

ئەمان ڕەنگن :

سوور 

سەوز( کەسک) 

زەرد 

ڕەش 

شین 

ئەمانە میوەن:

خەیار 

مۆز 

ترێ 

شووتی 

خۆخ 

سێو 

---

**– پرسیار و وەڵام**

1ـ برا گەورەی عەزیز ناوی چییە؟

2 ـ باوکی عەزیز و سەعید ناوی چییە ؟

3 ـ بۆچی بزنە ڕەش زۆر جاران باعە باع دەکا؟

4 ـ عەزیز و سەعید بۆچی بزنەڕەشیان بردە چۆم؟

5ـ سەعید ڕووی کردە عەزیز و گوتی چی ؟

6 ـ بزنە ڕەش چی دیت کە بە توندی باعاندی؟

7 ـ عەزیز بە دیتنی ژووژک چی گوت ؟

8 ـ ئایا ئێوە قەت ژووژک ـ تان بینیوە؟

9 ـ ژووژک لە کوێ دەژی؟

10 ـ سەعید دەربارەی ژووژک چی بە عەزیز گوت؟


ئەمە خۆخە . خۆخ بەری داری خۆخە. دارە خۆخ زۆر بەرز نییە.


ئەمە سێوە. سێو بەری داری سێوە. دارە سێو لە دارە خۆخ بەرزترە.


ئەمە ترێ یە. ترێ بەری داری (مێو)ە. دارە مێو زۆر بەرز نییە.

خۆخ و سێو و ترێ بەری دارن.

---

ـ ئەم وشانەی ژێرەوە بخوێنەوە و یەکەم پیتی هەر یەکەیشیان بڵێ !

عەزیز ـ عەرەب ـ عارف ـ بزن ـ بەرخ ـ باش ـ ژووژک ـ ژان ـ ژیر ـ سێو ـ ساوان
ـ ڕۆژین ـ شادان ـ شووتی ـ شەو ـ چەوەندەر ـ چاو ـ چرا ـ خەو ـ خاوەرخان ـ خانم ـ خۆخ ـ
نان ـ نەرم ـ نازدار ـ بەرد ـ بیبار ـ باران ـ دەنگ ـ دەست ـ دۆست ـ ڕەنگ ـ ڕاست ـ ڕێواس ـ
کاوە ـ کەو ـ کراس ـ گورگ ـ گەورە ـ گران ـ گەرم ـ ماسی ـ مار ـ مشک ـ فاتم ـ فەریدە ـ فەرید
ـ قاز ـ قادر ـ قەند ـ قاقەز ـ زستان ـ زارا ـ زێڕ ـ زۆر ـ ژوور ـ ژێر ـ ژەنگ ـ ژوان .

---

ـ سێ وشە بڵێ ، کە پیتی ئاخریان ( خ) بێ .

ـ سێ وشە بڵێ، کە پیتی ئاخریان ( ز) بێ.

---

ـ ڕستەکانی خوارەوە بخوێنەوە و جێگای وشەی داکەوتوویان بە وشەی پێویست پڕ کەوە:

بۆ نموونە : 1 کراسی مام سارم سەوز نی یە . 2 کراسی مام سارم شین نییە .

ڕێگای گوندەکان بۆ شار زۆر باش ..................... .

خۆخ بەری دارە سێو .....................

ژووژک زیانی بۆ ئێمە .....................

مار دۆستی ئێمە .....................

ـ سارا و سۆیبە و سەیران خوشکن. سارا خوشکی بچووکە. سۆیبە خوشکی نێونجی یە و سەیران خوشکی گەورەیە.







سەیران خوشکی گەورەیە سۆیبە خوشکی نێونجی یە سارا خوشکی بچووکە

---

ـ ئەمانە بزانە :

دانیشتووانی شاری نەغەدە = نەغەدەیی

دانیشتووانی شاری شنۆ = شنۆیی

دانیشتووانی شاری بانە = بانەیی

دانیشتووانی شاری بۆکان = بۆکانـی

دانیشتووانی شاری کۆ = کۆیی

دانیشتووانی شاری کرماشان = کرماشانـی







پشت

پیاز ( پیواز)

پەنجەرە







پەنیر

تۆپ

کەپۆ (کەپو)




پاپۆڕ ( کەشتی )



**پاوان کچی دادە سەکینە و کاک زاگرۆسە.**

**پشکۆ کوڕی دادە سەکینە و کاک زاگرۆسە.**

**دوێنێ کاک  زاگرۆس و خێزانەکەی چوونە بازاڕ.**

**دادە سەکینە جووتێک گوارە و بووکێکی بۆ پاوان کڕی.**

**پشکۆ تووڕە بوو.  پشکۆ گوتی :**

**ـ بووک بۆ پاوان دەکڕن ، منیش دەمەوێ !**

**دادە سەکینە پێکەنی و گوتی :**

**ـ چ خێر بوو پشکۆ! تۆیش بووکت دەوێ ؟**

**پشکۆ گوتی :**

**ـ نەخێر من بووکم ناوێ... بووک بۆ پاوان دەکڕن، منیش تۆپ دەکرم و تۆپم دەوێ.**

**کاک زاگرۆس تۆپێک و جووتێک کەوشی بۆ پشکۆ کڕی.**

**کاک زاگرۆس و دادە سەکینە و پشکۆ و پاوان گەڕانەوە.**



**پاوان و پشكۆ**

**پاوان بووكی كڕی . پاوان و دەستەخوشكەكانی بوك بووكێن دەكەن.**

**پشكۆ تۆپی كڕی . پشكۆ و دەستە براكانی تۆپ تۆپێن دەكەن.**

**دادە سەكینە و كاك زاگرۆس سەیری پاوان و پشكۆ دەكەن.**

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

**مامۆستا :**

**پیتی (پ) دوو جۆرە. (پـ)ی بچووک و (پ)ی گەورە.**

ئێوە ئەم پیتانەی ژێرەوە دەناسن. کامە پیت هەر دووک جۆری گەورە و بچووکی هەیە، لە بازنەی بەرامبەریان دا ئەم نیشانەیە(+) دابنێ.

ا ◯ و ◯ ب ◯ ر ◯ د ◯ ی ◯ ێ ◯ ن ◯ س ◯

ش ◯ ت ◯ م ◯ ج ◯ چ ◯ ۆ ◯ ک ◯ گ ◯ ف ◯

ق ◯ ز ◯ ژ ◯ خ ◯ ع ◯

---

**ـ پرسیار و وەڵام:**

1ـ پشکۆ بۆچی تووڕە بوو؟

2 ـ دادە سەکینە بۆچی پێکەنی ؟

3 ـ کاک زاگرۆس و خێزانەکەی بۆ کوێ چوون ؟

4 ـ دادە سەکینە چی بۆ پاوان کڕی؟

5 ـ ئەگەر تۆپیان بۆ پشکۆ نەکڕیبایە ، پشکۆ چی دەکرد ؟

6 ـ کاتێک ئەوان گەڕانەوە ، پشکۆ دەگەڵ دەستەبراکانی چی کرد؟

7 ـ کاتێک ئەوان گەڕانەوە ، پاوان دەگەڵ دەستە خوشکەکانی چی کرد ؟

8 ـ ئەو دەم کە ئەوان گەڕانەوە ، کاک زاگرۆس و دادە سەکینە سەیری چییان کرد ؟

- سەیری ئەم وشانە بکە :

| | | |
|---|---|---|
| 1 ـ تۆپ | تۆپێن | تۆپ تۆپێن |
| 2 ـ بووک | بووکێن | بووک بووکێن |
| 3 ـ باو | باوێن | باو باوێن |
| 4 ـ دار | دارێن | دار دارێن |
| 5 ـ شەپ | شەپێن | شەپ شەپێن |

- ئەم ڕستانە بخوێنەوە :

1 ـ کاک زاگرۆس باوکی پاوانە.

2 ـ کاک زاگرۆس باوکی پشکۆیە .

3 ـ کاک زاگرۆس باوکی پاوان و پشکۆیە.

4 ـ کاک زاگرۆس مێردی دادە سەکینەیە.

5 ـ دادە سەکینە دایکی پاوان و پشکۆیە.

6 ـ دادە سەکینە ژنی کاک زاگرۆسە.

- ئەمانە بزانە :

1 ـ پشکۆ و ئازاد برادەرن .

2 ـ پشکۆ و ئازاد دەستەبران.

3 ـ پشکۆ و ئازاد و ماردین برادەرن .

**4** ـ پشکۆ و ئازاد و ماردین دەستەبران.

1 ـ پاوان و تارا دۆستن .

2 ـ پاوان و تارا دەستەخوشکن.

3 ـ پاوان و تارا و شنە دۆستن .

4 ـ پاوان و تارا و شنە دەستەخوشکن.



**شاری نەغەدە**

**نەغەدە شارێکی مەزنی کوردستانە. شاری نەغەدە و شاری شنۆ نزیکی یەکن.**

**نەغەدەیی میوانگر و غەریب نەوازن.**

**کاک ئاغا کوڕی مام ئۆمەرە. مام ئۆمەر و کاک ئاغا نەغەدەیین. مام ئۆمەر و کاک ئاغا باغەوانن. ئەوان دوو باغ و دوو بێستانیان ئاوەدان کردۆتەوە. باغی کاک ئاغا گەورەیە و باغی مام ئۆمەر بچووکە.**

**مام ئۆمەر جاران سیغارکێش بوو. مام ئۆمەر بەکاتی کار سیغاری دەکێشا. چەند جاران دوکتۆر گوتبووی ئەگەر مام ئۆمەر سیغار بکێشێت، توانای کاری نامێنێت. مام ئۆمەر سیغاری فڕێ دا. مام ئۆمەر قەت دەست بۆ سیغار ناباتەوە. مام ئۆمەر دەزانێ سیغارکێشان نەخۆشی دێنێت.**

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

- وشەی هاومانا

نەخۆش = نەساغ

گەورە = مەزن

بچووک = چکۆلە = گچکە

سیغار = جگەرە

باب = باوک

خوێندنگە = فێرگە = قوتابخانە

خوێندکار = قوتابی

---

لەم وشانەی ژێرەوە دا ، پیتی (غ)، چەندەمین دەنگی وشەکانە؟

غەریب ، نەغەدە ،باغ ، سیغار ، غاردان.

ـ ئەمانە بزانە :

دانیشتووانی  شاری نەغەدە = نەغەدەیی

دانیشتووانی شاری شنۆ = شنۆیی

دانیشتووانی شاری بانە = بانەیی

دانیشتووانی شاری سەقز = سەقزی

دانیشتووانی شاری کەرکووک = کەرکووکی

دانیشتووانی شاری بۆکان = بۆکانــی

دانیشتووانی شاری سنە =  سنەیی

دانیشتووانی شاری ئامێد = ئامێدی

دانیشتووانی شاری کرماشان = کرماشانــی

ـ تۆیش دانیشتووانی ئەم شارانە لە بەرامبەریاندا بنووسە :

دانیشتووانی شاری سەردەشت =

دانیشتووانی شاری ڕەواندز=

دانیشتووانی شاری کامیاران =

دانیشتووانی شاری بیجاڕ =

**ـ لەم خشتانەی ژێرەوە دا ناوی سێ شاری کوردستان نووسراون، بەڵام پیتی یەکەمی هەر سێ شارەکان داکەوتووە. ئەمەش بزانە کە یەکەم پیتی هەر سێ شارەکان (سـ)ی بچووکە. کێ بتوانێ پیتی شاردراوەوە لە سەر جێی خۆی دابنێتەوە و ناوی شارەکان لە ژێرەوە بنووسێت، ئافەرین وەردەگرێت.**

| 1 | | ـە | ر | د | ە | شـ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 2 | | ـە | قـ | ز | | |
| 3 | | نـ | ـە | | | |

3 – ...........................

2 – ...............................

1 -...............................

**بەیان و گەزیزە پیتەکانی دوو شاری کوردستانیان جیا کردۆتەوە و دانە دانە لە نێو کەوانە دا نووسیویانن، کێ بتوانی لە چوارخانەی بەرامبەریاندا پیتەکان تێک بخاتەوە و ناوی شارەکان بنووسێتەوە، ئافەرینی بەیان و گەزیزە وەردەگرێت:**



(کـ) (ر) (مـ) (ا) (شـ) (ا) (ن) ☐

(کـ) (ـە) (ر) (کـ) (وو) (ک) ☐



پۆلیس



شەل



لـــانه(لانه)



لێو



لووت ( کەپۆ)



کلیل(کلیلە)



تەل( تێل)



**کەو**

**کەو ، پەلەوەرێکی نەخشین و ڕەنگین و دەنگ خۆشە. دەندووکی کەو سوورە. بەرگەردنی خەنەیی و خەت دارە. قاچەکانی سوور و جوانن.**

**کەو ، لە سەر کەل دەنیشێ و دەقاسپێنێ. دەنگی قاسپەی کەو لە چیاکان دا دەنگ دەداتەوە.**





**لـــانه و لـــاوه خوشک و بران. لانه و لاوه حەز بە دەنگی کەو دەکەن. باوکی لـــانه و لـــاوه ماسیگرە. باوکی لانه و لاوه حەز بە دەنگی کەو دەکا. ئەوان چوار کەویان لـە چوار قەفەس دا ڕاگرتووە. چوار کەوی لانه و لاوه بۆ ئازادی و بۆ ئازادبوون دەخوێنن.**

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

ـ وشەی هاومانا:

پەلەوەر = مەل

گەردن = مل = ئەستۆ

قاچ = لاق

کەل = شاخ = کێو

چیا = کوێستان

حەزلێکردن = خۆش ویستن

ئازادی = سەربەستی = ڕزگاری

قەفەس = قەوەز = ڕکە = هێلانەی تەلبەندی دەست ساز

---

ـ پیتی (ل) دوو جۆرە : (ل)ی گەورە و (لـ)ی بچووک .

کاتێک کە (لـ)ی بچووک و (ا) پێکەوە دێن ، دەکرێ بەم دوو جۆرە بنووسرێن:

لـ+ا=(لا)        لـ + ا=(لـــا)

ـ سەیری ئەم ناوانە بکە :

لانە (لـــانە)        لاوە (لـــاوە)        لالە(لـــالە)        دەلال (دەلـــال)

**ماموستا:** ڕستەکانی ژێرەوە بخوێنەوە و خشتە بەتاڵەکانی بەرامبەریان بە پیتی پێویست پڕ کەوە و وشەکان بدۆزەوە.

**ئا ـ لە سەر کەل دەنیشێ و دەقاسپێنێ.**

**ب ـ لانە و لاوە حەزی لێ دەکەن و لە قەفەس دا ڕایان گرتووە.**

| ب | ئا | | |
|---|---|---|---|
| ب | ک | ـە | |
| | | | |
| | و | | |

---

**ـ دەنگی کەو خۆشە. کەو دەقاسپێنێ.**

**ـ دەنگی بولبول خۆشە . بولبول دەچریکێنێ.**

**ـ دەنگی مریشک خۆشە. مریشک دەگارێنێ.**

**ـ دەنگی بۆق خۆشە. بۆق دەقرێنێ.**

**ـ دەنگی چۆلەکە خۆشە. چۆلەکە دەجریوێنێ.**

**ـ دەنگی مانگا خۆشە. مانگا دەبۆڕێنێ.**

**ـ دەنگی بزن خۆشە. بزن دەباڵێنێ.**

**ـ دەنگی سەگ خۆشە. سەگ دەحەپێنێ .**

**ـ دەنگی گور خۆشە. گوورگ دەلوورێنێ.**

**ـ دەنگی کەر خۆشە. کەر دەزەڕێنێ.**

---

ـ ئەم وشانەی خوارەوە بخوێنەوە و بڵێ یەکەم پیتی هەر وشەیەک چییە ؟

لـــاوە (لاوە) ، لـــانە(لانە) ، لەگەگ ، لـــالە(لالە) .

ـ ئەم وشانەی ژێرەوەش بخوێنەوە و بڵێ پیتی ئاخریان چییە؟

کەل ، چەل ، مەل ، شەل ، قەل ، پەل ، دەلال.





ـ برژانگ ناوی چەند کچانی نووسیوە، بەڵام پیتەکانی جیا جیا نووسیون و وشەی لێ ساز نەکردوون. کێ بتوانێ پیتەکان تێک بخاتەوە و ناوی کچەکان لە چوارخانەی بەرامبەریاندا بنووسێتەوە، برژانگ ئافەرینی پێ دەڵێ.

| | |
|---|---|
| لـ ... ا ... نـ... ـە | |
| لـ... ـە...یـ...لـ... ا | |
| پـ ... ا...و...ا...ن | |
| بـ ... ێـ ... ر...ی | |
| سـ ...ا...و...ا...ن | |



دڵ



گەڵــا(گەڵا)



گوڵ



گوڵدان



بێڵ



ستڵ(سەتڵ)



بەڵــاڵووک(بەڵاڵووک)



## داری بەڵاڵووک

بەر دەرگای ماڵی گوڵێ و گوڵاڵە، سێ داری بەڵاڵووکی لێ یە. لە سێ دارەکان دوویان گەورەن و دارێکیان گچکەیە. ئەمساڵ دارە گچکەکەیان گەڵا و گوڵی کرد، بەڵام دوو دارە مەزنەکان بەس گەڵایان کرد و گوڵیان نەکرد. داری بەڵاڵووک زۆر بەرز نابێ. گوڵی داری بەڵاڵووک سپی یە.



# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : دوو پیتی ژێرەوەمان خوێندوون:

1– (لـــ – ل)    2– (ڵـــ – ڵ)

پیتی ژمارە یەک ، پیتی (لـــ – ل)ی کز– ی پێ دەگوترێ.

پیتی ژمارە دوو ، پیتی (ڵـــ – ڵ)ی قەڵەوی پێ دەڵێن.

جیاوازیی نێوان (لـــ – ل)ی کز و (ڵـــ – ڵ)ی قەڵەو ئەمەیە کە:

پیتی(لـــ – ل )ی کز سادەیە و هیچ چەڵەمەیەکی لە سەر نییە. پیتی(لـــ – ل )ی کز دەتوانێ لە هەموو شوێنەکانی وشە دا بێت.

پیتی (ڵـــ – ڵ )قەڵەو سادە نییە و چەڵەمەیەکی دەکەوێتە سەر. پیتی (ڵـــ – ڵ ) قەت لە سەرەتای وشە دا نایە.

ئەم دوو پیتانە ، هەر دوکیان تیپی گەورە و مەزنیان هەیە:

(ڵـ)ی بچووک    (ڵ)ی گەورە

(لـــ)ی بچووک    (ل)ی گەورە

دوو پیتی (ڵ)ی قەڵەو و (ل)ی کز ، هەر دووکیان کاتێک دەنگی(ا)یان پێوە دەلکێت ، دەکرێ بە دوو جۆر بنووسرێن. بەمجۆرە:

لـــا (لا)    ڵـــا (ڵا)

ـ له بەری (1) دا چەند وشەیەک نووسراون، کە پیتی (لــ) و پیتی (ا )، یان پیتی(ڵــ)و پیتی(ا ) پێکەوە لکاون. هەر وەکی گوتمان، کاتێک کە لە وشەیەکدا پیتی (لــ) یان پیتی (ڵــ ) بە پیتی(ا)وە دەلکێن، دەکرێ بەم دوو جۆرە بنووسرێن(لــا ) و (لا).

له بەری (2) دا، ئێوەش هەر ئەو وشانە بە چەشنی دیکە بنووسن.

| 1 | 2 |
| --- | --- |
| گەڵــا | ............................... |
| ئاڵــا | ............................... |
| مەلــا | ............................... |
| باڵــا | ............................... |
| بەڵــالۆوک | ............................... |
| لەیلــا | ............................... |

ـ وشەی هاومانا:

گەورە = مەزن

بچووک = گچکە= چکۆڵە

گەلێک = زۆر

باڵا = بەژن

باڵندە = پەلەوەر = مەل

ـ وشەی دژ مانا :

گەورە # بچووک

زانا # نەزان

تێر # برسی

درێژ # کورت

قەڵەو # کز

ئاگا # نائاگا

---

ـ ئەم وشانەی ژێرەوە بخوێنەوە و بڵێ پیتی ئاخریان چییە ؟

ساڵ ، ماڵ ، کاڵ ، باڵ ، تاڵ ، گوڵ ، چڵ ، دڵ ، گڵ

---

ـ ئەم وشانە بخوێنەوە و بڵێ پیتی یەکەمیان چییە؟

لـانە(لانە) ، لـاوە (لاوە) ، لـانکە(لانکە) ، لـاق(لاق) ، لـالەش(لالەش)

---

مامۆستا: شەش ڕستەکانی ژێرەوە بخوێنەوە وماڵی بەتاڵی خشتەکان پڕ کەوە!

1ـ بێچووی مەڕ.

2ـ کەوەکانی لانە و لاوە لە قەفەس دا بە هەوای ئەو شتە دەخوێنن.

3ـ دار و دەرخت لە بەهار دا دەیکەن و بۆنیان خۆشە.

4 ـ منداڵان لە فێرگەکاندا لێی دەخوێنن.

5 ـ لە ژمارە بژاردن دا دوای پێنج دێت.

6 ـ وەرزی سەرما و بەفر بارینە.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ر | ـە | بـ | 1 |
| | د | ا | ز | ا | ئـ | 2 |
| | | | | و | گـ | 3 |
| | | | ێـ | تـ | کـ | 4 |
| | | | | ـە | شـ | 5 |
| | | ا | تـ | سـ | ز | 6 |



**بەحر**



**حەوز**



**حەوت مۆرە**



**گوندی حەوتەوانە**

**دادە ڕیـحـان و کاک حەمەتاڵ ژن و مێردن. دادە ڕیـحـان و کاک حەمەتاڵ خەڵکی گوندی حەواتەوانەن. گوندی حەوتەوانە خۆش دیمەنە. ماڵەکانی گوندی حەوتەوانە لە داوێنی کێوی (بەسری) دا ساز کروان. کێوی بەسری بەرزە. کێوی بەسری بەسەر شاری سابڵاغ دا دەڕوانێت. لە پشتی پەنجەرەی ماڵەکانی دێی حەواتەوانەوە شاری سابڵاغ دیارە. لە سەربانی ماڵەکانی گوندی حەوتەوانەوە بەحرەکەی پەنا شاری سابڵاغیش دیارە.**



**کاک حەمەتاڵ و دادە ڕیــحان لە ماڵەکەی خۆیاندا دوو مانگا و دوو بزنیان ڕاگرتووە. ئەوان دوای تەواوبوونی کاری مەزرا ، باقەیەک گیا بۆ مانگا و بزنەکانیان دەبەنەوە. دادە ڕیــحان لە ڕۆژ دا دوو جاران مانگا و بزنەکان دەباتە سەر کانی. مانگا و بزنەکان لە ئاوی کانی و حەوزی نێو دێ ئاو دەخۆنەوە. دادە ڕیــحان لە شیری بزن و مانگاکان ماست و پەنیر ساز دەکات.**







**حەلیمە**

**حەلیمە کچی دادە ڕیــحان و کاک حەمەتاڵە. حەلیمە لە خوێندنگەی گوندەکەیان دا دەرس دەخوێنێ. کاک سەلاح، مامۆستای فێرگەی گوندی حەوتەوانەیە.حەلیمە لە خوێندنگەکەیان دا یاریکاری مامۆستا سەلاح و منداڵەکانە. لە ماڵیشدا هاودەستی دایکێتی و خزمەتی مانگا و بزنەکان دەکات.**

# تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : چوار پیتی(ح) و (خ) و (ج) و (چ ) لە یەک بنەماڵەن و شێوەی نووسینیان وەکی یەکە.
هەر چواریان چەشنی گەورە و بچووکیان هەیە:

(حـــ – ح )    (خـــ – خ )   (جــ – ج)   (چــ – چ)

ـ دەگەڵ هاورێی پەنا باڵت ، دوو بە دوو ئەم وشانەی ژێرەوە بخوێننەوە. یەکتان بەری (1) و ئەوی ترتان بەری(2) بخوێنێتەوە و پیتی یەکەمی وشەکان بۆ یەکتر بڵێنەوە :

| (1) | ( 2 ) |
|---|---|
| خوشک | حەوت |
| خانی | حامید |
| خەرمان | حەوشە |
| جەواد | جامی |
| جووجەڵە | چاو |
| چۆم | چرا |
| خاتوون | خەڵک |
| حەیران | حەسەن زیرەک |
| جوان | جوانمێر |
| چەرم | چێشت |
| چەور | چوار |
| خەو | خاڵ |

ـ لەم دوو ڕستانەی ژێرەوە دا دوو وشە بە ڕەنگی سوور نووسراون. ئایا ئەم دوو وشەیە هاومانان ، یان دژ مانا؟

1 ـ دادە ڕیحان و کاک حەمەتاڵ خەڵکی (گوند)ی حەوتەوانەن.

2ـ دادە ڕیحان و کاک حەمەتاڵ خەڵکی (دێ)ی حەواتەوانەن.

ـ لە دوو ڕستانەی خوارەوە دا ، ئەم دوو وشەیەی کە بە ڕەنگی سوور نووسراون ، دوو وشەی هاومانان .

لە سەربانی ماڵەکانی گوندی حەوتەوانەوە (بەحر) دیارە.

لە سەربانی ماڵەکانی گوندی حەوتەوانەوە (زرێ) دیارە.

بەحر = زرێ

ـ لەم دوو ڕستەی خوارەوە دا دوو وشە بە ڕەنگی سوور نووسراون. ئایا ئەم دوو وشەیە هاومانان ، یان دژمانا؟

1 ـ دوێنێ مانگاکانی دادە ڕیحان زۆر (برسی) بوون.

2 ـ دوێنێ بزنەکانی دادە ڕیحان زۆر (تێر) بوون.

ـ له خوارەوە چەند وشەی هاومانا و دژمانا لێکدراون. بۆ جیاکردنەویان پێویستە بە وردی بخوێندرێنەوە و لە بازنەی نێوانیاندا یەکێک لەم دوو نیشانەیە دابندرێت.

نیشانەکان ئەمانەن :

بۆ دوو وشەی هاومانا ئەم نیشانەیە: (=)

بۆ دوو وشەی دژمانا ئەم نیشانەیە: (#)

| | | |
|---|---|---|
| 1 ـ درێژ ◯ کورت | 2 ـ ڕەش ◯ سپی | 3ـ گوند ◯ دێ |
| 4 ـ سارد ◯ گەرم | 5 ـ تاڵ ◯ شیرین | 6 ـ گەورە ◯ مەزن |
| 7 ـ بچووک ◯ گچکە | 8 ـ گەلێک ◯ زۆر | 9 ـ باڵندە ◯ مەل |

---



ـ ئاسكۆڵ ناوی چوار براكەی خۆی لە سەر چوار لاپەڕە دا نووسی، بەڵام لە هەر ناوەی پیتی یەكەمیانی بیر كرد. ئێوە ناوەكان لە نێو چوارخانەكانی خوارەوە دا دەبینن. ئەگەر ناوی هەر چوار براكانی ئاسكۆڵ بە پیتی (شـ) دەست پێ بكات، ئایا دەتوانن ناوەكان بۆ ئاسكۆڵ تەواو بكەن؟

| ـەماڵ | ارۆ | ێركۆ | ێروان |
| --- | --- | --- | --- |

ـ سێ وشە بنووسە ، كە بە پیتی (جـ) دەست پێ بكەن.

1 ـ ....................... 2 ـ ............................ 3 ـ ................................

**– پرسیار و وەڵام**

1 ـ ئێمە بە خەڵکی شاری بۆکان دەڵێین : بۆکانی . ئەدی بە خەڵکی شاری سابلاغ چی دەگوترێت؟

2 ـ گوندی حەوتەوانە لە داوێنی چ شاخێکدا ساز کرواە ؟

3 ـ ئایا ئێوە هیچ گوندێک دەناسن کە لە داوێنی شاخ و کێو دا ساز کرابێت؟

4 ـ لە سەربانی ماڵەکانی گوندی حەوتەوانە چی دەبینرێت ؟

5 ـ ئایا ئێوە قەت لە بەحر دا مەلەتان کردووە؟

6 ـ شوێنێک کە دەریا و ئاوی لێ بێ خۆشترە، یان جێگای وشک و بێ ئاو ؟

6 ـ چ زیندەوەرانێک لە ئاو دا دەژین؟

7 ـ دار و دەرخت و شیناوەرد لە جێگای بێ ئاو زۆرترە، یان لە جێگای ئاودار دا ؟

8 ـ بە بڕوای ئێوە، مراوی باشتر مەلە دەکات یان مریشک ؟

9 ـ ئەگەر ماسی لە ئاو بێتە دەر، چی لێ دێت؟

10 ـ دادە ڕیحان ماست و پەنیر لە چی ساز دەکات ؟

11 ـ مانگا دەبۆڕێنێ و بزن دەباڵێنێ ، ئەدی جووجەڵەی مریشک چلۆن بانگی دایکی دەکات؟



کاک شاهۆ          سۆیبەخانم

سۆیبەخانم و کاک شاهۆ ژن و مێردن. کاک شاهۆ و سۆیبەخانم لە دێ دەژین. ژیانی دێهات ئاسوودە و بێ خەم و بەدوور لە هەرایە. کاک شاهۆ و سۆیبەخانم سێ منداڵیان هەیە.



هێمن هێدی هەلاڵە

کاک شاهۆ و سۆیبەخانم کچێک و دوو کوڕیان هەیە. کچەکەیان ناوی (هەلاڵە)یە. هەلاڵە دوو ساڵانەیە. دوو کوڕەکانیان(هێدی) و (هێمن)ن. هێمن یازدە ساڵانەیە و هێدی هەشت ساڵ لە تەمەنی تێدەپەڕێ. هێدی و هێمن دەخوێنن. ئەوان لە هەفتە دا شەش ڕۆژان دەچنەوە فێرگە و دەخوێنن. بەڵام هەلاڵە چەلێ منداڵە و ناچێتە فێرگە. هێدی و هێمن ڕۆژانی هەینی ناچنەوە فێرگە. ڕۆژانی هەینی هەلاڵە و هێدی و هێمن پێکەوە کایە دەکەن.



کاک شاهۆ باغەوانە. باغەکەی کاک شاهۆ هەژدە دار هەنجیر و هەشت دار هەنار و پێنج دار هەڵووژەی تێدایە. هەنجیری باغی کاک شاهۆ زۆر شیرینە، بەڵام هەنار و هەڵووژەکانی زۆر ترشن. کاک شاهۆ ترێ و سێو بە دێهات دا دەگێڕێ و دەیفرۆشێ. بەڵام هەنجیر و هەنار دەباتە شار و لە شار دەیفرۆشێ.

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : ئەم پیتەی لەم دەرسە دا خوێندمان، بچووک و گەورەی نییە. ئەمەیان(هـ) دەتوانێ بکەوێتە سەرەتا و ناوەندی وشە و هەمیش دەتوانێ لە ئاخری وشەش دا بێت.

وەک: هەور ـ مەهاباد ـ گوناهـ

ئەمەیان(ـهـ) هەمیشە دەکەوێتە ناوەندی وشە.

وەک : دێهات ـ نـهـێنی

ـ ئەم وشانەی ژێرەوە بخوێنەوە و بڵێ پیتی (هـ) لە چ شوێنکی وشەدا هاتووە؟

هات . هەور . هەنگوێن . هەڵاڵە . هێمن . هەتاو . هێدی . هەنار . هەنجیر . هەڵووژە . هاوین . هەناسە . هەولێر . هەرمێ . هاوڕێ . هەڵۆ . هێرۆ .

ـ ئەم وشانەی خوارەوە بخوێنەوە و بڵێ پیتی (هـ) لە چ شوێنێکی وشە دا هاتووە؟

مەهاباد . دهۆک . شاهۆ . شەهاب . فەرهاد . دەهۆڵ . بەهار .

ـ ئەم وشانەی خوارەوە بخوێنەوە و بڵێ ئەم تیپە(ـهـ)یە لە چ شوێنێکی وشە دا هاتووە؟

دێهات . نـهێنی . کێهەیان(کامەیان) .

ـ ئەمە بزانە :

شاری **مەهاباد** دوو ناوی هەیە . جاران (**سابلاغ**)بوو ، ئێستا (**مەهاباد**)ـە.

---

ـ ئەم نیشانەیە(=) لە نێوان دوو یان چەند وشەی هاومانا دا دادەنێین. بەڵام دوو وشەی دژمانا لەم کتێبەدا بەم نیشانەیە دیاری دەکرێن: (#).

ئەم چەند وشەیەی کە وا لە بەرامبەری یەکتر دا نووسراون و بازنەیەکیشان لە نێوان دایە ، تۆ پێت وایە کێهەیان لەم دوو نیشانانەی سەرەوە دەتوانین لە نێو بازنەکاندا دابنێین؟

1 ـ شیرین ◯ ترش

2 ـ دوور ◯ نزیک

3 ـ سارد ◯ گەرم

4 ـ مەزن ◯ گەورە

5 ـ چاک ◯ باش

6 ـ باش ◯ خراپ

7 لادێ ◯ دێهات

---

ـ هەلالە و گولالە دەستەخوشکن .

ـ ئازاد و ئاوات دەستەبران.

ـ دوو کچ پێکەوە دەستەخوشکن. دوو کوڕ پێکەوە دەستەبران.

ـ حەلیمە و فاتمە و ساوان دەستەخوشکن.

ـ هەژار و هێمن و هەڵگورد پێکەوە دەستەبران.

ـ چەند کچ پێکەوە دەستەخوشکن.

ـ چەند کوڕ پێکەوە دەستەبران.



**بۆکان**

**بۆکان، شارێکی مەزن و خۆش دیمەن و ڕازاوەی کوردستانە. لە ناوەندی شاری بۆکان دا حەوزێکی مەزن هەڵکەوتووە. بە پەنا شاری بۆکان دا چۆمێکی گەورە تێپەڕ دەبێ. کێوی(ناڵەشکێنە)لە نێوەڕاستی شاری بۆکان دایە. شاخ و کێوەکانی دەور و بەری شاری بۆکان وەکوو بووکان جوان و نەخشینن. خەڵکی شاری بۆکان ڕووح سووک و ڕووخۆش و میهرەبانن.**



**یاسەمەن و سەیران**

**یاسەمەن و سەیران کچە بۆکانین. یاسەمەن ئامۆزای سەیرانە. یاسەمەن و سەیران دەستەخوشک و هاودەم و ئاواڵن. ئەوان پێکەوە لە یەک فێرگە و لە یەک پۆل دا دەخوێنن. یاسەمەن و سەیران مانگی جۆزەردانی ئەمساڵ لە خوێندن تەواو دەبن. جووتەی ئامۆزایان هاوینی ئەمساڵ خۆیان بۆ زانکۆ ئامادە دەکەن. هەرچەند کە هەوای هاوینانی شاری بۆکان گەرم دەبێ، بەڵام ئەوان پەکیان بە گەرمای هاوین ناکەوێ و دەخوێنن. یاسەمەن دەیەوێ ببێتە مامۆستای منداڵانی وەپاشکەوتووی زەینی، بەڵام سەیران دەیەوێ لە بەشی کۆمپیۆتەر دا دەرس بخوێنێ.**



**یاسەمەن برایەکی هەیە ناوی (سامان)ە. سامان هونەرمەندی شانۆگەری و سینەما و تێئاترە. سامان بالآبەرز و لاوچاکە. سامان دۆستی خۆشەویستی منداڵانە. منداڵانی شاری بۆکان کاتێک کاکە سامان دەبینن، بۆی دەچن و ڕۆژباشی پێ دەڵێن. سامان دەستی لاواندنەوە بە سەریان دا دەکێشێت و ماچیان دەکات و بۆ خوێندن هانیان دەدات.**



**سەیران دوو خوشکی هەیە. گەورەکەیان ناوی (هەنار)ە. بچووکەکەیان ناوی (سێوێ)یە. تەمەنی هەنار یازدە ساڵە و سێوێ سێ ساڵانەیە. هەنار و سێوێ حەز بە مۆسیقا دەکەن و پێیان خۆشە ببن بە گۆرانی بێژ.**

---

**مامۆستای بەڕێز!**

**لەم دەرسە دا پیتی (یـ ــ ی )هاتووە. ئەم پیتە دەگەڵ پیتی (یـ ــ ی)، کە لە لاپەڕەی(32 ) و لە دەرسی نۆ(9) دا هاتووە، جیاوازە. جیاوازییەکەیان ئەمەیە کە ئەمەیان پیتی چەقیو(کۆنسۆنانت)ە. بەڵام ئەوەی تریان پیتی دەنگبزوێن(ڤوکال)ە. جیاوازی و تەفاوەتی پیتە چەقیوەکان و دەنگبزوێنەکەن ئەمەیە کە:**

**1 ـ پیتی چەقیو(کۆنسۆنانت) دەتوانێت لە هەموو شوێن و بەشەکانی وشە دا بێت، بەڵام دەنگبزوێنەکان لە نووسینی کوردیدا بەم شێوە خەتە ـ (نەک بە تیپی لاتین)ـ قەت لە سەرتای وشە دا نایەن.**

**2 ـ پیتە چەقیوەکان دەتوانن دوو بە دوو پێکەوە و هاوشانی یەکتر لە یەک وشەدا بێن، بەڵام دوو پیتی دەنگبزوێن قەت ناتوانن لە یەک وشەدا شان بە شانی یەکتر و پێکەوە خۆ بنوێنن.**

## تەمرینی مامۆستا و قوتابی

مامۆستا : ئەم حەوت شارانەی ژێروو دراوسێی یەکن:

**سەقز ، بۆکان ، مەهاباد ، پیرانشار ، سەردەشت ، شنۆ و نەغەدە.**

**مەڵبەندی موکریان** لەم حەوت شارانە و سەدان دێ پێک هاتووە.

**کوردی موکری** بەو کوردانە دەگوترێ، کە لە **مەڵبەندی موکریان** دا دەژین.




**نەخشەی جوغرافیایی مەڵبەندی موکریان**

**ـ پرسیار و وەڵام**

**1 ـ کام شار سەرووترینی شاری مەڵبەندی موکریانە؟**

**2 ـ خوارووترین شاری مەڵبەندی موکریان کامە شارە ؛**

**3 ـ  شاری بۆکان لە نێوانی کامە شارەکانی موکریان دا هەڵکەوتووە؟**

**4 ـ شاری نەغەدە و کام شاری موکریان دراوسێی یەکن؟**

**5 ـ شاری پیرانشار لە چ بەرێکی مەڵبەندی موکریان دا هەڵکەوتووە؟**

**6 ـ شوێنی هەڵکەوتنی شاری مەهاباد لە مەڵبەندی موکریان دا چۆنە؟**

**7 ـ چوار شاری سەرووی مەڵبەندی موکریان ناو بەرن.**

---

**ـ ئەمە بزانە :**

**کۆنترین شاری مەڵبەندی موکریان شاری( سەقز) و نوێترین شاری ئەم مەڵبەندی شاری (پیرانشار)ە.**

---



**تاڤگە و سولاڤ**

**سولاڤ ئامۆزای تاڤگەیە. سولاڤ چوار ساڵانەیە و تاڤگە پێ دەنێتە پێنج ساڵەی تەمەن. تاڤگە و سولاڤ تەمەنیان کەمە و بۆ فێرگە نابن. ئەوان پێکەوە دەچنە پۆلی ساوایان و لە پۆلی ساوایان دا گوێ لە شیعر و گۆرانی و چیرۆک دەگرن و فێر دەبن. مامۆستا ڤیان، مامۆستای سولاڤ و تاڤگەیە. ئەوان مامۆستای خۆیان زۆر خۆش دەوێ.**

تاڤگە لە ماڵ دا تاقانەیە و هیچ خوشک و برایەکی نییە. بەڵام سولاڤ برایەکی شەش مانگانەی هەیە.



براکەی سولاڤ، (ئاڤان)ی ناوە. ئاڤان شیرەخۆرەیە و هەتا برسی دەبێ، هەر دەگری.



دایکی سولاڤ جارجار ئاڤان بۆ سولاڤ و تاڤگە جێ دەهێڵێت و بە شوێن کار دا دەچێتە دەر. سولاڤ و تاڤگە خەریکی ئاڤان دەبن و ناهێڵن بگری. ئاڤان جارجار گاڵ و گغ دەکات . کچەکان بە گاڵ و گغ گوتنی ئاڤان تێر تێر پێدەکەنن.

تاڤگه و سولاڤ عاشقی گوڵ و گوڵزارن. ئەوان هەموو ڕۆژێک پێکەوە دەچنە نێو گوڵزار و هەر یەک چەپکە گوڵێکی جوان دەچنێت.



تاڤگه چەپکە گوڵی خۆی بۆ دایکی دەباتەوە، بەڵام سولاڤ چەپکە گوڵی خۆی بۆ ئاڤان دەباتەوە و لە تەنیشت لانکەکەی دا دادەنێت. سولاڤ بە ئاڤان دەڵێ:

ـ بڤ ئاڤان، نەکەی گوڵەکان بخۆی!



تاڤگە و سولاڤ بووک بووکێن دەکەن. ئەوان کراس و کەوا و دەرپێ بۆ بووکەکانیان دەدورن و دەبەریان دەکەن.

ڕۆژێک سولاڤ و تاڤگە خەریکی جلک دوورین بوون. لە پڕ تاڤگە گوتی:

ـ سولاڤ ، لە پەنجەرەی جیرانەکەتان بڕوانە!

سولاڤ گوتی:

ـ ئێ ئێ!... لەم دوو کوڕانە بڕوانە!... بڕوانە چلۆن لە پشتی پەنجەرەوە سەیرمان دەکەن!



سولاڤ و تاڤگە پێکەوە هەستان و لە بەرامبەر پەنجەرە دا ڕاوەستان. سولاڤ بانگی کوڕەکانی کرد و گوتی:

ـ کوڕینە ئەوە بۆچ لە پشتی پەنجەرەوە سەیرمان دەکەن؟

کوڕەکان ترسان و خۆیان لە ژێر پەنجەرەکە دا شاردەوە. کچەکان تێر تێر پێکەنین.





## (دەرسی سی و شەش)

## چیرۆکی سارم

زستانە و بەفرێکی زۆر باریوە. (سارم) دەیەوێ بچێتە دەر و بەفری بەر درگاکەیان کۆ بکاتەوە. ئەگەر ئێوەیش بە وردی سەیری (24)ڕەسمەکانی ئەم چەند لاپەڕەیە بکەن، دەتوانن چیرۆکێک بۆ (سارم) و کارەکانی ساز بکەن و بۆ دایە و بابەی بگێڕنەوە.






## (دەرسی سی و حەوت)



### هەڵپەڕکێ

کچەکان وەرن!... وەرن شایی و هەڵپەڕکێمانە!

هەلاڵە وەرە ! گوڵاڵە وەرە ! فەرەنتی وەرە ! سۆیبە وەرە ! هەنار وەرە !

گەزیزە وەرە ! بەیان وەرە ! شیلان وەرە ! سێوێ وەرە ! شەمێ وەرە !

کچینە وەرن ! وەرنە داوەتێ !

گەورە کچەکان وەرن!... وەرن شایی و هەڵپەڕکێی ئێمە بێ ئێوە سارد و سڕە !

وەرن گەورە کچەکان!... وەرن دنیاکەی ئێمە بێ ئێوە چۆڵ و قاقڕە !

## (دەرسی سی و هەشت)



گوڵاڵە هەڵاڵە

هەڵاڵە و گوڵاڵە دوو دەستەخوشکی خۆشەویستی یەکترن. ئەگەر ئەوان ڕۆژێک یەکتر نەبینن، ئارام ناگرن. هەڵاڵە و گوڵاڵە هاوتەمەن و هاودەرس و دراوسێی یەکن. هەڵاڵە کچە سنەیی یە و گوڵاڵە کچە مەهابادی، بەڵام ئێستا لە وڵاتی (سوید) دەژین و لە شاری ستۆکهۆڵم دەرس دەخوێنن . جووتەی ئاواڵان ئەمساڵ ساڵی ئاخری خوێندنیانە و خۆیان بۆ زانکۆ ئامادە دەکەن. هەڵاڵە بە نیازە لە بەشی چاو دا دەرس بخوێنێ و ببێتە دوکتۆری چاوان، بەڵام گوڵاڵە حەز بە کۆمپیۆتەر و تەکنیک دەکا و دەیەوێ بە شوێن ئەو بەشە دا بچێ.

## (دەرسی سی و نۆ)




### جەژنی نەورۆز

نەورۆز، جەژنی سەری ساڵی نەتەوە ئێرانییەکانە. نەتەوەی کوردیش کە یەکێک لە بنەماڵە هەرە کۆنەکانی ئێرانی یە، لە هەر شوێنێک و لە هەر پارچەیەکی ئەم دنیایە دا بژی، هەر ساڵێک ئەم جەژنە بە گەرمی بەڕێوە دەبات.

هەڵاڵە و گوڵاڵە بۆ شایی و بەزمی نەورۆزی ئەمساڵ، کە لە کۆشکی مەزنی شاری ستۆکهۆلم دا بەڕێوە دەچێت، خۆیان ئامادە دەکەن. هەر دووکیان جلکی کوردی دەبەر دەکەن و بەنیازن هەتا کۆتایی جەژنەکە هەر هەڵپەڕن و یەکدەم نەسرەوون.

قەرارە لە جەژنی نەورۆزی ئەمساڵدا هونەرمەندە ناودارەکانی کوردی دەرەوەی وڵات بەشدار بن. هەڵاڵە حەز بە دەنگی خۆشی (مەرزە)خانم دەکات. گوڵاڵەش دەنگی گەرمی کاک نەجمەی غوڵامی پێ خۆشە و بەکاتی تەنیایی هەمیشە گوێ لە دەنگی ئەو ڕادەگرێت.

## (دەرسی چل)



### مامۆستا پەروین

مامۆستا پەروین خەڵکی مەهابادە. مامۆستاپەروین لە شارەدێی(ئیندرقاش) دا مامۆستای پۆلی پێنجەمی سەرەتاییە.

شارەدێی ئیندرقاش ناوەندی مەڵبەندی شارویرانە. شارویران مەڵبەندێکی مەزنی وەرزێرییە و لە تەنیشت شاری مەهاباد دا هەڵکەوتووە.

مامۆستا پەروین لە پۆلەکەی خۆیدا حەوت قوتابی ژیکەلانەی هەیە.

قوتابییەکان، مامۆستاکەی خۆیان زۆر خۆش دەوێ و بە دیتنی ئەو دەگەشێنەوە.

مامۆستا پەروین خەمخۆری هەژارانە و یەکجار زۆر میهرەبان و ڕووخۆش و دەم بە پێکەنینە.

## (دەرسی چل و یەک)

### ساڵ ـــ وەرز ـــ مانگ

کاتژمێری نۆی بەیانی ڕۆژی شەممەیە. مامۆستا پەروین تازە گەیشتۆتەوە لای منداڵەکان. دوای ڕۆژباش و چاک و چۆنی، ڕووی پرسیاری لە قوتابییەکان کرد و لێی پرسین:

ـ کێ دەزانێ ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە و چەندی مانگە و لە چ وەرزێکی ساڵ داین؟

تەوار، کچە ژیرەک و زانای پۆلەکە گورج دەستی بەرز کرد و گوتی :

ـ ئەمڕۆ، ڕۆژی شەممەیە و بیست و یەکی مانگی ڕەزبەرە و لە وەرزی پایزی ساڵ داین.

مامۆستا پەروین ئافەرینی پێ گوت و لێی پرسی :

ـ باشە تەوار گیان، بڵێ بزانین ساڵ چەند وەرزە و وەرزەکانی ساڵ کامانەن؟

تەوار وەڵامی داوە:

ـ ساڵ چوار وەرزە . وەرزی بەهار ، وەرزی هاوین ، وەرزی پایز و وەرزی زستان.

ئەمجار مامۆستا پەروین ڕووی کردە (هەوشین) و گوتی :

ـ ئێستا هەوشین باسی وەرزی (بەهار)مان بۆ دەکات . هەوشین فەرموو!



هەوشین، برای تەوار دەستی پێ کرد:

ـ وەرزی بەهار سێ مانگە. مانگەکانی ئەمانەن :خاکەلێوە، بانەمەڕ و جۆزەردان. لە خاکەلێوە دا بەفری زستان دەتوێتەوە و باران دەبارێ و چۆمەکان هەڵدەستن. لە مانگی بانەمەڕ دا کوردستان دەبێتە بەهەشت. گوندەکەی ئێمە لە مانگی بانەمەڕ دا بە شیناوەرد و گوڵ و گوڵزار دەخەملێت. جۆزەردان مانگی ئاخری بەهارە. لەم مانگە دا قوتابییەکان دەگەڵ مامۆستا و فێرگەکان ماڵاوایی دەکەن و پشووی هاوین دەست پێ دەکات. جۆزەردان کاتی کار و خەباتی لادێیەکانە. مانگی جۆزەردان جۆ دەگاتێ و کاتی دروونەوە و هەڵگرتنەوەی گژ و گیایە.

## ساڵ ـــ وەرز ـــ مانگ

دوای پشوودان، مامۆستا و قوتابییەکان هاتنەوە لای یەکتر و دانیشتن. مامۆستا پەروین گوتی:

ـ ئێستا (وسوو) باسی وەرزی هاوینمان بۆ دەکات. با بزانین وەرزی هاوینی کاکە وسوو چۆنە و دەڵێ چی... کاکە وسوو فەرموو!



وسوو هاتە بەر تەختەڕەشەی پۆلەکە و دەستی پێ کرد:

ـ وەرزی هاوینیش سێ مانگە. لەم وەرزە دا هەرچی میوەی خۆش و بەتامە دەگەنێ و ئێمەیش دەیان خۆین. مانگەکانی وەرزی هاوین ئەمانەن: مانگی پووشپەڕ، مانگی گەلاوێژ و مانگی خەرمانان. سێ مانگەکانی ئەم وەرزە هەوا زۆر گەرم دەبێت و من لە چۆمەکەی بەر ماڵان نایەمە دەر و هەر مەلە دەکەم.

منداڵەکان هەموو پێکەنین . هەمزە گوتی:

ـ منداڵینە، وسوو لە هاوین دا دەبێتە ماسی !

وسوو گوتی : ـ نەخێر نابمە ماسی، بەڵام دەمەوێ ببمە مەلەوانێکی باش و لە هەموو دنیا دا یەکەم بێمەوە.

## ساڵ ـــ وەرز ـــ مانگ

مامۆستا پەروین ڕووی لە ئارێز کرد و گوتی :

ـ ئارێز گیان ئەمجارە نۆرەی تۆیە و، تۆ دەبێ باسی وەرزی پایزمان بۆ بکەیت.



ئارێز لە جێ هەستا و دەستی پێکرد:

ـ وەرزی پایز سێ مانگە. مانگەکانی ئەمانەن: مانگی ڕەزبەر، مانگی خەزەڵوەر و مانگی سەرماوەز. لە سەرەتای پایز دا فێرگەکان دەکرێنەوە و قوتابی و مامۆستا بە دیداری یەکتر شاد دەبنەوە. لە مانگی ڕەزبەر دا ترێ دەگاتێ. لە مانگی خەزەڵوەر دا گەڵای دار و درەختان زەرد و سوور دەبن و کەم کەمە دەوەرن. لە مانگی سەرماوەز دا گوڵ و گوڵزار سیس دەبن و مەلە کردنی کاکە وسووش تەواو دەبێت.

منداڵەکان پێکەنین. وسوو گوتی :

ـ بە خودای پایز نەگبەتە!

## ساڵ ــــ وەرز ــــ مانگ

وەرزی زستان مابوو باس بكرێت. (شنۆ)، خوشكی وسوو ئەم وەرزەی هەڵبژارد بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە (شنۆ) نەخۆش بوو. لە جێی ئەو دا، (فەرەنتی) هەستا و بەمجۆرە دەستی پێكرد:



ـ زساتن چوارەمین وەرزی ساڵە. زستانیش هەر وەكی وەرزەكانی تر سێ مانگە. مانگەكانی وەرزی زستان ئەمانەن: مانگی بەفرانبار، مانگی ڕێبەندان و مانگی ڕەشەمە. لە سەرەتای بەفرانبار دا بەفر دەبارێت و هەتا ئاخری ڕەشەمە بەفر هەر دەمێنێت. من زستانم زۆر خۆش دەوێ و پێم خۆشە هەمیشە زستان بێ.

وسوو هاواری لێ هەستا و گوتی :

ـ مامۆستا!... مامۆستا گیان بە فەرەنتی بڵێ زستانەكەی تەواو بكات. من حەز بە زستانی دوور و درێژ ناكەم.

## ساڵ ـــ وەرز ـــ مانگ

گەلاوێژ لە سەر لاپەڕەیەک دا چوار وەرزی ساڵی بەم چەشنە نووسیبوو. گەلاوێژ لاپەڕەکەی بە مامۆستا پەروین نیشان دا. مامۆستا پەروین گەلێکی سپاس کرد و لاپەڕەکەی لە سەر دیواری پۆلەکە دا هەڵواسی.



## (دەرسی چل و دوو)




**کوردستان**

کوردستان وڵاتی کوردانە. کوردستان دڵ و گیانی گەلی کوردستانە. ئێمەی منداڵانی کورد لە هەر جێیەک و لە هەر شوێنێک بژین، خۆمان بە کورد دەزانین و کوردستانمان لەبیر ناچێ. نیشتمانی کوردان وڵاتێکی پان و بەرینە، پڕ لە دارستان و مێرگ و چەم و ئاو و کانی یە. چیای بەرزی تێدایە، دەشتی جوان و ڕەنگینی هەیە و شوێنی گەرمەسێریشی هەیە.

چەند شاری مەزنی کوردستان ئەمانەن کەرکووک، هەولێر، ئامێد، دێرسیم، مەردین، قامیشلۆک، زاخۆ، مەهاباد، بۆکان، بانە، مەریوان، سلێمانی، سنە، سەقز، سەدەشت، پێنجوین، خانەقین، قەسری شیرین، ورمێ و کرماشان...

دوو شاری کەرکووک و کرماشان کانگا و چاڵاوی نەوتیان تێدایە. کەرکووک و کرماشان سۆمایی چاوی کوردانن.

## (دەرسی چل و سێ)



### کورد

کورد یەکێک لە بنەماڵە هەرە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستە و دەگەڵ نەتەوە ئێرانییەکانی تر خزمایەتییەکی کۆن و لەمێژینەیان هەیە. کوردەکان لە ڕابوردوو دا هەموو پێکەوە و لە یەک وڵات دا ژیاون، بەڵام شەڕ و کێشەی دراوسێیانی کورد، بۆتە هۆی پارچە بوونی خاک و نیشتمانی کوردان.

ئیمڕۆکە هەر بەشێکی کەم لە خەڵک و خاکی کوردستان لە ئێران دا ماونەتەوە. بەشی هەرە مەزنی خەڵک و خاکی نیشتمانی کوردان لە ژێر چنگی تورکییە دایە و بەشێکی تریشی کەوتۆتە ژێر دەست و دەسەڵاتی دوو وڵاتی عەرەبی.

## (دەرسی چل و چوار)

### گەلانی کوردستان

چەند نەتەوەی دیکەش لە نیشتمانی کوردان دا دەژین، کە دەگەڵ کوردان شەریک و برابەش و هاونیشتمانن. گەلی کوردستان بە هەموو دانیشتووانی کوردستان دەگوترێ. گەلی کوردستان ڕووخۆش و دڵگەش و ئازادیخوازن. ئاواتی هەرە بەرزی گەلی کوردستان، پێکەوە ژیانی سەربەستانە و ئازادانەی هەموو گەل و نەتەوەکانی سەر ڕووی زەمینە.

# ڕێنووسی زمانی کوردی

## پیتی زمانی کوردی :

مەبەست لە پیت و، پیتی زمانی کوردی، سەرجەم ئەو شکڵ و نیشانەگەلەن کە لە نووسیندا و، لە نووسینی زمانی کوردیدا پێیان دەنووسین و بە یارمەتیی ئەوان مەبەستەکانمان دێنینە سەر لاپەڕە. ئەم شکڵ و نیشانەگەلەش لاسایەکن لە پیتەکانی زمانی عەرەبی، کە ئەوانیش لە سریانی و فەنیقی و لە نووسینی (ئارامی)یەکان وەریان گرتووە. عەرەبەکان، ئێرانییەکان و کوردەکان هەر یەک بە پێی فۆن و ئاوای گوتنی زمانەکەیان، ئاڵوگۆڕێکیان بە سەر شکڵ و نیشانەگەلەکان هێناوە و پیتی زمانی خۆیانیان لێ چێ کردووە.
پیتەکانی کوردی سەرجەم، 36 دانەن ؛ بەم تەرتیبە:

ئـ ، ا ، ە ، ب ، ت ، پ ، ج ، چ ، ح ،خ ، د ، ر ، ڕ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ق ، ڤ ، ک ، گ ، ل ، ڵ ، م ، ن ، ، و ، و ، ۆ ، وو ، هـ ، ی ، ی ، ێ ، پیتی نادیار( بزرۆکە).

پیتەکانی زمانی کوردی، هەروەک هەموو زمانەکانی تری ئیمڕۆیی، بە دوو دەستە دابەش دەکرێن.

1 دەنگبزێنەکان(VOWELS)

2 دەنگەکان(دەنگە چەقیوەکان) (Consonants)

**الف . دەنگبزوێنەکان** (VOWELS) : بۆ بزواندنی دەنگە چەقیوەکان و بۆ سازکردنی وشە دەکار دەکرێن. لە ڕاستیدا، بە یارمەتیی دەنگبزوێنەکانە کە (دەنگە چەقیوەکان) جووڵە و بزووتنیان تێدەکەوێت و دەکرێ زمان لە دەمدا بگەڕێت و، وتن و گوتن و ئاخاوتن مسۆگەر ببێت و وشە بنووسرێت.
دەنگبزوێنەکانی زمانی کوردی بریتین لە:

1 . دەنگبزوێنی ( ا )، یان ئەلفی درێژ.

2 . دەنگبزوێنی ( ە )= بەرامبەر بە (فەتحە)ی عەرەبی

3 . دەنگبزوێنی ( و ) ، یان واوی بێ گرێ.

4 . دەنگبزوێنی ( ۆ )، یان واوی کراوە = بەرامبەر بە (زەممە)ی عەرەبی.

5 . دەنگبزوێنی ( وو )، یان واوی قوچاو.

6 . دەنگبزوێنی ( ێ ) ، یان (یێ)ی خاو= بەرامبەر بە(کەسرە)ی عەرەبی.

7 . دەنگبزوێنی ( ی ) ، یان (یێ)ی کرژ .

8 . دەنگبزوێنی ( ی )، یان (یێ)ی سادە.

9 . دەنگبزوێنی نادیار ، یان [بزرۆکە]#

# [ بزروکە] ، دەنگبزوێنێکی ناسک و کورتە، کە لە تیپی ئەلفبای(کوردی ـ عەرەبی) دا دیار نییە و کرمانجی ژێروو هیچ شکڵ و نیشانەیەکی بۆ ئەم دەنگبزوێنە ساز نەکردووە. بەڵام کرمانجی ژووروو، کە بە تیپی لاتین دەنووسن، ئەم نیشانەیان بۆ دەنگبزوێنی بزروکە داناوە: ( i ) .
ئەم وشانەمان بە هەر دوو شێوە خەت نووسیوە. هەر وەکی دەی بینن، جێی بزروکە لە تیپی (کوردی ـ عەرەبی) دا بەتاڵە . بەڵام لە نووسینی لاتینی دا بزروکە وەک دەنگبزوێنێکی سەربەخۆ لە وشەکاندا دیارە:

دەستت(Destit) ـ باڵت (Balit) ـ سارم (Sarim) ـ هاتم(Hatim)

نەبوونی تیپێکی تایبەت بۆ نیشاندانی دەنگبزوێنێک لە ڕێنووسی زمانێکدا، ئەمە دەگەیەنێت کە ئەو شێوە ئەلفبایە بۆ نووسینی ئەو زمانە، ناتەواوە. واتە یان دەبێ نیشانەیەکی وەک ئەو نیشانەیەی کە مامۆستای هێژا، پرۆفیسۆر دوکتۆر جەمال نەبەز، بۆی پێشنیار کردووە، دەکار بکرێت، یان تیپی ئەلفباکە بگوڕدرێت.

## تایبەتمەندییەکانی دەنگبزوێنی زمانی کوردی:

بۆ ناسینەوەی دەنگبزوێنەکانی کوردی و جیاکردنەوەیان لە دەنگە چەقیوەکان، دوو بنە(قاعدە)ی دیاریکراوی خوارەوە دەخەینە بەرچاو :

1 . دەنگبزوێنەکانی زمانی کوردی( لە تیپی ئەلفوبێی کوردی ـ عەرەب) دا ، قەت ناکەونە سەرەتای وشە. واتە بەم شێوە خەتەی کە ئێستا پێی دەنووسین، هیچ دەنگبزوێنێک لە سەرەتای هیچ وشەیەک دا خۆی نانوێنێت . بەڵام تیپی لاتینی کوردی لەم بنەیە(قاعدە) پەیڕەوی ناکات. بۆ وێنە، لە نووسینی وشەی (**ئازاد**) دا، یەکەم پیت، دەنگی چەقیوی(**ئـ** )یە و دوای ئەم پیتە چەقیوە، دەنگبزوێنی ئەلفی درێژی(**ا** ) دێت و پێکەوە دەنگی (**ئا**) پێک دێنن. لەحاڵێکدا بۆ نووسینی وشەی ئازاد بە تیپی لاتین، یەکجێ و لە دەسپێکدا دەنگبزوێنی ( A ) دێت و وشەی ( adAz )ی پێ دەنووسرێت.

2 . لە نووسینی کوردیدا، قەت دوو دەنگبزوێن پێکەوە و شان بە شانی یەک، لە یەک وشە دا نایەن.

ئەگەر دەنگە چەقیوەکانی کوردی (Consonants) بە ( C ) و دەنگبزوێنەکان(VOWELS)

بە ( V )نیشان بدەین، فورمولی دەنگ و دەنگبزوێنەکانی ئەم وشانەی خوارەوە بەم تەرتیبە دەبن:

| | | |
|---|---|---|
| دۆ | V+C | ( دەنگ + دەنگبزوێن) |
| باش | C+V+C | ( دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ) |
| بەفر | C+V+C+V+C | ( دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + بزروکە+ دەنگ) |
| کورسی | V+C+C+V+C | ( دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگ + دەنگبزوێن) |
| یارسان | C+V+C+C+V+C | ( دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ) |
| کۆتر | C+V+C+V+C | ( دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + بزروکە + دەنگ) |
| ئاسۆ | V+C+V+C | ( دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگبزوێن) |
| سارم | C+ V+ C+ V+ C | (دەنگ +دەنگبزوێن + دەنگ + بزروکە + دەنگ) |

## پێناسەی دەنگبزوێنەکان:

### 1 . دەنگبزوێنی (ا)، یان ئەلفی درێژ:

گەلێ کەس لە کاتی هاوێژ(تەلەفوز)ی دەنگبزوێنی(ا)دا، یەکجی دەڵێن(ئا)؛ کە ئەمە هەڵەیە. لە ڕاستیدا هاوێژی بێ هەڵەی ئەم دەنگبزوێنە بەمجۆرەیە کە لێوەکان بە تەواوی دەکرێنەوە و زمان بە ژێر تەختی خوارەوەی خۆیەوە دەنووسێ . ئەوسا لە قورگەوە، دەگەڵ دەردانی پشوو، دەنگێک بە چەشنی دەنگی مروڤی لاڵ لە دەم دێتە دەر.

ئەم دەنگبزوێنە هەر بەس یەک جۆری هەیە، ئەویش ئەمەیە: ( ا ). لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی تیپی (کوردی ـ عەرەبی)، ئەم دەنگبزوێنە قەت لە دەسپێک و سەرەتای وشە دا نایە . جێگای ئەم دەنگبزوێنە، نێوەڕاست و ئاخری وشەیە. ئەم دەنگبزوێنە و هەر پیتێکی تر کە کلکدار نەبن و کلکیان نەکەوتبێتە سەر (*خەتی زەمینە*)، # خۆیان لە خۆیاندا ئەم توانایەیان نییە لە دەسپێکی وشەدا بە پیتی دیکەوە بلکێن، بەڵام پیتە بێ کلکەکان دەتوانن بە کلکی پیتە کلکدارەکانی بەر لە خۆیانەوە بلکێن. بۆ نموونە ئەم پیتانە کلکدار نین و لە سەر خەتی زەمینە ڕانەکشاون:( ر . و . ا . د . ز . ژ . وو . ە . ڕ . )،کەواتە هیچکامیان ئەم توانایەیان نییە بە پیتی دوای خۆیانەوە بلکێن. بەڵام هەموو ئەو دەنگانەی کە کلکدارن و کلکیان لە سەر خەتی زەمینە ڕاکشاوە، دەتوانن بەم بێ کلکانەوە بلکێن. بۆ وێنەوە :

**بەراز ، زمان ، هەنار ، ساوا ، دارا ، ئاواز ...**

# (مەبەست لە خەتی زەمینە ئەو هێڵە ئاسۆییانەن کە لە لاپەڕە خەت دارەکان دا ڕەسم دەکرێن بۆ ڕێک نووسین لە سەر لاپەڕەکەدا).

### 2 . دەنگبزوێنی ( ە ) ـ هێی کز :

ئەم دەنگبزوێنە هاوتا و هاودەنگی (فەتحە)ی زمانی عەرەبی یە. بۆ هاوێژ(تەلەفوز)ی ئەم دەنگبزوێنەش، هەر ئەو جۆرەی کە بۆ هاوێژی (ا) ئەلفی درێژ گوترا، لێوەکان دەکرێنەوە و زمان بە ژێر تەختی خۆیەوە دەنووسێ و دەگەڵ دەردانی هەوا لە قورگ، دەنگی ئەم دەنگبزوێنە لە دەم دێتە دەر. جیاوازیی هاوێژی ئەم دەنگبزوێنە دەگەڵ هاوێژی دەنگبزوێنی(ئەلفی درێژ) ئەمەیە، لە کاتی هاتنە دەری دەنگی ئەلفی درێژ لە قورگەوە، دەنگ بۆ سەر دەچێت و هی دەنگبزوێنی هێی کز( ە )،دەنگ بە خشکەیی لە دەم دێتە دەر. ئەم دەنگبزوێنە یەک جۆری هەیە . وەک : **پەل ، کەر ، قالە ، نالە ، بالە ، کەو، مەڕ ، نەشمیل، دەم ، دەرد ،شۆرە ، بۆرە ، وەرە، دەوە [دەسکردێکی ئافرەتی کوردەوارییە لە دێهاتەکاندا ( ریخ و پەینی پاتاڵ بە ئاو دەگرنەوە،بە زەبری دەست و بێڵ و قاچ خۆشی دەکەن و قالب قالب لە بەر هەتاوی هاوینی دادەنێن و ئەوسا بۆ سووتەمەنی زستان و بۆ تەندوور، لە قەڵاغەکانیان دا پاشەکەوتی دەکەن.)]**

### 3 . دەنگبزوێنی (ۆ) ــ واوی کراوە :

ئەم دەنگبزوێنە چەڵەمەیەکی لە سەرە و دەنگبزوێنێکی کراوەیە. ئەم دەنگبزوێنەش یەک چەشنی هەیە . لە وشە دا دەتوانێ بە پیتی کلکداری پێش خۆیەوە بلکێت و هەمیش دەتوانێ بە تەنیا و بە بێ لکان بە پیتی دیکەوە خۆ بنوێنێت. وەک :

**دۆ ، درۆ ، مەڕۆ ، هێرۆ ، بۆق ، سۆران ، هەڵۆ ، بۆرانی ، نۆرە ، سۆل(پێڵاو) ...**

### 4 . دەنگبزوێنی (و ) ــ واوی بێ گرێ :

ئەم دەنگبزوێنە بێ چەڵەمەیە و دەنگەکەیشی ڕەوان و کورت و قرتاوەوەیە. هەر بەس یەک جۆرەی هەیە و لە وشە دا بە پیتی کلکداری پێش خۆیەوە دەلکێت و دەتوانێ بە تەنیاییش بێت. وەک دەنگی (و) لەم وشانەی خوارەوە دا :

**کورد ، کورسی ، کورت ، کوردستان ، گورگ ، چەکوچ (چەکوش)، دومان ، درومان ، سوتمان ...**

شایانی باسە بگوترێت کە لە بەرەی دەنگە چەقیوەکانیشدا (واو)ێکمان هەیە کە هەر بە چەشنی (واو)ی بێ گرێ دەنووسرێت و بە ڕواڵەت هیچ جیاوازییەکیان لە نێواندا نییە. هەر بۆیە گەلێک جاران بە هەڵە دەگەڵ دەنگبزوێنی (واو)ی بێ گرێ تێکەڵ دەکرێن. بەڵام ئەگەر تایبەتمەندییەکانی دەنگبزوێنی کوردی لە نووسین بە تیپی(کوردی ــ عەرەبی) دا بخەینە بەر چاو ، جیاوازیی نێوان پیتی چەقیوی(و) دەگەڵ دەنگبزوێنی (و) ، بە ئاشکرا دەردەکەوێت.

دەنگبزوێنەکان لەم شێوە نووسینەدا ئەم تایبەتمەندییانە ڕەچاو دەکەن :

1 . قەت لە سەرەتای وشە دا نایەن.

2 . قەت دوو دەنگبزوێن لە یەک وشە دا شان بەشان و پێکەوە خۆ نانوێنن.

بە پێی تایبەتمەندیی ژمارە یەک ، هیچ یەک لە (واو)ەکانی سەرەتای ئەم وشانەی ژێرەوە، دەنگبزوێن نین و پیتی چەقیون :

**وشک ، وانێک**[لە زاراوەی موکریان، بەتایبەت خەڵکی مەهاباد ، ئەم وشەیە لە جێاتی (هین)ی زاراوەکانی تری کوردستان، دەکار دەکرێت.] ، **وەرە ، وەستا ، واق ، وەڵیو**(ناوی گوندێکی نزیک بە شاری سەردەشت ــ ە ). **وان**( ناوی شارێکی باکووری کوردستانە) ، **ورگ ، ورد ، وشە ، ورچ**.

به پێی تایبەتمەندیی ژمارە (دوو)ش، هیچ کام لە (واو)ەکانی ئەم وشانەی ژێرەوە ناتوانن دەنگبزوێن بن:

**کاوڕ، کەو، کاوە، مەودا، ماوە، شەو، داو، سەودا، دەوە، سەوەتە، شەوە، ڕەوەدە، هەویر، زویر، داوەت، ماوەت، هەوێردە(**ناوی باڵندەیەکی خۆش دەنگە) **.**

چونکە هەریەک لە (واو)ەکان لە ڕاست و چەپەوە جیرانی دەنگبزوێنانن و، دەزانین کە قەت دوو دەنگبزوێن شان بەشان و پێکەوە لە یەک وشە دا خۆ نانوێنن.

## 5 . دەنگبزوێنی (وو) ـ واوی قووچاو.

دەنگبزوێنێکە یەک چەشنی هەیە. دەنگەکەی بە قەدرایە دوو (واو)ی بێ گرێ کێشدار و کێشراوەوەیە. ئەم دەنگبزوێنەش دەتوانێ بە پیتی کلکداری بەر لە خۆیەوە بلکێت و هەمیش دەتوانێ بە تەنیا بێت. وەک :

**دوو ، زوو ، خوو ، سوور ، توور ، پوور ، دوور ، سنوور ، خاپوور ، کووڕ ، ئەستوور ، شەیپوور...**

## 6 . دەنگبزوێنی (یـ ، ی)ی کرژ :

دەنگبزوێنێکە چەشنی گەورە و بچکۆڵەی هەیە. گەورەکەی بێ کلک و بێ خاڵە . چەشنی گەوەرەکەی لە وشەدا بە پیتی کلکداری بەر لە خۆیەوە دەلکێت و دەتوانێ بە تەنیاییش لە وشە دا بێت. بەڵام چەشنی بچکۆڵەکەی کلکدارە و دوو خاڵی لە ژێرەوە هەیە. چەشنی بچکۆڵەکەی چونکە کلکدارە، لە بەرەوە و لە دواوە بە پیتی دیکەوە دەلکێت.

دەنگی ئەم دەنگبزوێنە قوڵ و قورسە و هەر دەڵێی دوو (ی) پێکەوە و یەکجێ لە دەم دێنە دەرێ. جاران لە چاپەمەنی و لە کتێبە کوردییەکاندا بۆ دەکار هێنانی (ی)ی کرژ، دوو خاڵیان لە ژێرەوەی دادەنا ، بەم جۆرە:(ي)

دەنگی ئەم دەنگبزوێنە لەم وشانەی خوارەوە باش دەر دەکەوێت:

**سی ، عەلــی ، وەلــی ، دزی ، ژیر ، دیل ، پیــر ، شیــر ، نیــر ، هەویــر ، پەنیــر ...**

## 7 . دەنگبزوێنی (ێ)ی خاو

ئەم دەنگبزوێنە بەرامبەر (کەسرە)ی زمانی عەرەبییە. بە ڕواڵەت هاو وێنەی (ی)ی گرژ دەنووسرێت، بەڵام ئەمەیان چەڵەمەیەکی لە سەرە و دەنگەکەیشی خاو و کراوەوەیە. ئەم دەنگبزوێنەش تیپی گەورە و بچووکی

هەیە و هەرچی دەربارەی (ێ)ی کرژ گوتمان، ئەمەش هەر ئەو تایبەتمەندییانەی هەیە. دەنگی ئەم دەنگبزوێنە لەم وشانەی ژێرەوە دەردەکەوێت:

**ژێ ، جێ ، ڕێ ، پێ ، دەمەوێ ، شێر ، نێر ، مێ ، وێنە ، ئاوێنە ، هەوێن ...**

[ شایانی باسە بگوترێ کە هەندە وشەیەکی وەرگیراو لە زمانی جیرانەکانیش ، کە ژمارەیان زۆر نییە، چەشنە (ی)یەکی دەنگبزوێنیان تێدایە کە بە (ی)ی سادە نیودێر کراون. وەک : وەزیر ، شیعر ، میهرەجان ، میهرەبان ، میهر ، حیزب ، میرزا ، میر ، ئەمیر ، میداد ، میترا ، میهرداد]

هەر وەها پێویستە بگوترێت کە سەرەڕای سێ دەنگبزوێنی (ی)ی گرژ ، (ێ)ی خاو و (ی)ی سادە ، لە نێو دەنگەچەقیوەکانی زمانی کوردیدا، (ی)یەکمان هەیە کە دەنگبزوێن نییە و پیتی چەقیوە. ئەم پیتە ئەگەرچی بە دیمەن و بە ڕواڵەت وەکی (ی) دەنگبزوێنەکان دەنووسرێت، بەڵام بە پێی ئەو تایبەتمەندییانەی کە بۆ دەنگبزوێنەکان گوتران، ئەمەیان ناتوانێ لە ڕەدەی دەنگبزوێنەکاندا جێ بگرێت و دەکەوێتە خانەی پیتە چەقیوەکانەوە . بۆ وێنە :

**یار ، یازدە ، مامەیارە ، یاسەمەن ، یەک ، یۆسف ، یۆنس ، یاڵاوە( گوندێکی نزیک شاری بۆکانە) ، یاڵ ( یالّی ئەسپ... سەرپشتی شاخ و کێو) ، یەکشەوە( گوندێکی نزیک شاری بۆکانە و بە عەمباری گەنم و دانەوێڵەی موکریان بە نێوبانگە)...**

## ب . دەنگەکان (دەنگە چەقیوەکان) = ( پیتە چەقیوەکان )

دەنگەکان ، یان دەنگە چەقیوەکان (sConsonant ) ،بەو پیتانە دەگوترێ کە خۆیان لە خۆیاندا جووڵە و بزووتنیان نییە و ئەگەر دەنگبزوێنەکان نەبن، جووڵە و بزووتن بۆ سەر و خواریان نابێت و لە ئاکامدا کەرت و سیلاب و وشەیان لێ ساز نابێت و زمان لە دەمدا ناگەڕێت. پیتە چەقیوەکان بیست و نۆ دانەن ، بەم تەرتیبە:

**ئـ . ب . پ . ت . ج . چ . ح . خ . د . ر . ڕ . ز . ژ . س . ش . ع . غ . ف . ق . ڤ . ک . گ . ل . ڵ . م . ن . و . ە . ی .**

شایانی باسە بگوترێت کە زمانەوانانی کورد لە سەر ڕەسەنایەتی و پێداویستیی و حاڵاتی چەندێک لەم پیتانە، لە گەڵ یەکدا بۆچوونی جیاوازیان هەیە. بۆ وێنە چەندێک لە زانایانی زمانەوانیی کورد پێیان وایە دەنگی (ح ، ع ، غ ) ڕەسەنایەتیی کوردییان نییە و دەکرێ ئەم پیتانە شار بەدەر بکرێن و لە جێی ئەواندا لە سێ پیتی ( هـ ، ئـ ، خ ) کەڵک وەربگیرێت. بۆ وێنە وشەی ( حاواندنەوە) بکرێتە (هاواندنەوە) ، دوو وشەی (عێل و عەشیرەت) بکرێنە ( ئێل و ئەشیرەت ) و وشەی (غەڵەبایی) بکرێتە ( خەڵەبایی) . هەروەها لە سەر دەنگی چەقیوی (ئـ)، زانایانی زمانەوانیمان هێشتا بە قەناعەتێکی یەکسانی چارەساز نەگەیشتوون.

هەندێکیان دەڵێن پیتی ناوبراو (فۆنیم)ە، چەندێکیان دەڵێن (دەنگ)ە و جەماعەتێکیان دەڵێن نە دەنگە و نە فۆنیمە.
من لەم نووسراوەیەدا هەموو پیتە چەقیوەکانم بە (دەنگ)و دەنگدارەکانیشم بە دەنگبزوێن ناو بردووە. لەم ڕێنووسە دا و لە کتێبۆکەی پۆلی یەکەمی سەرەتایی دا، من گوێم لە هەرای زانایانی زمانەوان قەپات کردووە و چاوم لە بۆچوونی جیاوازیان نووقاندووە. دەنگی چەقیوی(ئـ) لە زمان و ئەدەبییاتی کوردیدا چ دەنگ بێت و چ فۆنێم یان هیچیان، هەروەها ئەگەر سێ دەنگی (ح، ع ، غ ) شاربەدەر کرابن و لە جێی ئەواندا سێ دەنگی ( هـ، ئـ، خ ) داندرابن، بە حوکمی ئەوەیکە لە قسەکردن و لە نووسینی باب و باپیرانمان دا هەبوون و هەر هەشن، من لە کتێبۆکەی منداڵاندا دەکارم هێناون .

## دەنگەکان (پیتە چەقیوەکان)

هەروەکی گوتمان، ژمارەی بەستی گەروویی، یان دەنگە چەقیوەکان، بیست و نۆ دانەن. لە ژێرەوە پێناسە و تایبەتمەندییەکانی هەر بیست و نۆ دانەیان، دانە دانە دەخەینە بەرچاو و لە سەریان دەدوێین.

### دەنگی چەقیوی ( ئـ ) :

ئەم پیتە یەک چەشنی هەیە و گەورە و بچووکی نییە. ئەم دەنگە لە زمانی کوردی ( کرمانجی خواروو)دا جێگاکەی سەرەتای وشەیە و پێش هەموو دەنگبزوێنێک دەکەوێت. چونکە پیتێکی کلکدارە، لە کلکەوە بە هەموو دەنگبزوێنەکانەوە دەلکێت . وەک :

**ئازاد ، ئاوات، ئەو، ئیتر ، ئاگر ، ئۆگر ، ئۆخەی ، ئەسرین، ئێوارە ، ئاش، ئەهوورائەمەزدە ، ئۆردوو ، ئەردەڵان ، ئەرخەیان ...**

### دەنگی چەقیوی (بـ . ب ) :

ئەم دەنگە دوو چەشنی گەورە و بچووکی هەیە. بچکۆڵەکەی کلکدارە و لە کاتی دەکارهێنان لە وشەدا، کلکەکەی دەکەوێتە سەر خەتی ڕاخراوی سەر لاپەڕە(خەتی زەمینە) و بە پیتەکانی پێش و پاش خۆیەوە دەلکێت. دەنگی چەقیوی (بـ . ب )، دەتوانێ لە هەموو شوێنەکانی وشەدا بەم چوار وێنەیە خۆ بنوێنێت:

**[( بـ : وەک باران ) ، ( ـبـ : وەک سبەینێ ) ، ـب : وەک قەڵب) ( ب : وەک کەڵەباب)]**

تیپی بچکۆڵەی (بـ ) دەتوانێ لە سەرەتا و لە نێوەڕاستی وشە دا خۆ بنوێنێت، بەڵام چەشنی گەورەکەی بێ کلکە و بەس دەتوانێ بە تەنیایی یان لە ئاخری وشە دا بە پیتی پێش خۆیەوە بلکێت. تیپی بچکۆڵەکەی وەک :

**باران ، بەران ، بۆق ، سەبر ، سێبەر ، هەمبەر ...**

تیپی گەروەکەی وەک :

کەباب ، باب ، قەڵب(ناڕەسەن ، بەدەڵ) ، دەڵب(ناڕەسەن ، بەدەڵ)، کەڵەباب ،شەراب ...

## دەنگی چەقیوی ( پـ . پ ) :

ئەم دەنگەش لە بنەماڵەی (بـ . ب)یە و هەرچی دەربارەی ئەو دا گوتمان، بۆ ئەمەیش بە کارە. وەک :

**پێڵاو ، پڵاو ، پیر ، تەپڵ ، تەپڵۆک ، خشپە ، خەپە ، پەپوولە ، سپی ، سپڵە...**

**قاپ ، شەپ ، ئەسپ ، تۆپ، گووپ ، شیپ ...**

## دەنگی چەقیوی ( تـ . ت ) :

ئەم دەنگەش لە بنەماڵەی دەنگی چەقیوی (بـ . ب یە و هەرچی دەربارەی ئەوم دا گوتمان، بۆ ئەمەیش بەکارە. وەک :

**تەرزە ، تازە، تەتەر ، تۆز ، پشتێند ، نیشتمان ، نەتەوە ، هەتاو ، دیتن ، شووشتن ...**

**پەت ، دەست ، لووت ، لەت ، قەت ، هەشت ، تەشت ، سەردەشت ، شت...**

## دەنگی چەقیوی ( جـ . ج ) :

دەنگی چەقیوی (جـ . ج)، تیپی گەورە و بچووکی هەیە . بچووکەکەی خاڵدارە. خاڵەکەی دەکەوێتە ژێرەوەی. کلکدارە و لە کاتی نووسیندا کلکی دەکەوێتە سەر (خەتی زەمینە) و بە پیتی پێش خۆی و دوای خۆیەوە دەلکێت. لە سەرەتا و نێوەڕاست وشە دا دەتوانێ جێ بگرێت. چەشنی گەورەکەی بێ کلکە و دەتوانێ لە ئاخری وشە دا بە تەنیا بێت، یان پیتێکی کلکداری تری پێوە بلکێت. وەک :

**جیک جیکە، جێگا، جەواڵ، جل ، جوولەکە، جۆگە، جاو، جووچکە، هەنجیر ، زنجیر ، پەنجە ، مجری...**

**تانج، باج، گەنج ، ڕەنج ، سەرنج ، برینج ، دێو و درنج ، ساج، میرحاج...**

## دەنگی چەقیوی ( حـ . ح ) :

ئەم دەنگەش لە بنەماڵەی پیتی چەقیوی(جـ . ج یە و هەرچی دەربارەی ئەو دا گوتمان ، بۆ ئەمەیش هەر بەکارە. وەک :

**حەوت . حەیتە(زەلامی تەژەی ناقۆلا)، قەحبە ، سەحەر ، سەحرا ، حەرام ، حەوت ، حەلوکە(بەلالووک)، حەوتەوانە( گوندێکە لە پەنا شاری مەهاباد)...**

**ڕوح ، نووح ، تەماح...**

## دەنگی چەقیوی ( خـ . خ ) :

ئەم پیتەش لە بنەماڵەی پیتی چەقیوی(جـ . ج)یە و هەرچی دەربارەی ئەو دا گوتمان ، بۆ ئەمەیش هەر بەکارە. وەک :

**خەزێم ، خاو ، خێڵ ، خێل ، خەرمان ، شەختە ، تەختە ، خوشک، میخەک ، سیخە ، سیخوڕ ، خەو ...**

**بەرخ ، شاخ ، داخ ، پەخ ، پەرداخ ، پڵتۆخ ( شلەپەتە، تەوەزەل ) ...**

## دەنگی چەقیوی ( چـ . چ ) :

ئەم پیتەش لە بنەماڵەی پیتی چەقیوی(جـ . ج یە و هەرچی دەربارەی ئەو دا گوتمان ، بۆ ئەمەیش هەر بەکارە. وەک :

**چاو ، چیمەن ، مەچەک ، چەمچەماڵ ، چەقۆ ، چەوت ، بێچوو ، چینچک ، چەقە ، ، کەوچک(کەچک) ، لەچەر ...**

**قاچ ، ماچ ، کۆچ ، ورچ ، پرچ ، چرچ ، هەڵپاچ داپاچ ، کچ ، لچ(لیچ) ...**

## دەنگی چەقیوی (د ) :

ئەم پیتە بێ خاڵە. هەربەس یەک فۆڕمی هەیە و گەورە و بچووکی نییە. ئەم پیتە بێ کلکە و جگە لە نۆ پیتی (ا .ر. ڕ .ز. ژ . و .ۆ .وو .ە) هەموو پیتەکانی تری پێوە دەلکێن. پیتی چەقیوی ( د )، لە هەموو شوێنێکی وشە دا دێت . وەک :

**دەرزی، دەست، بدە، ددان ، بازدان ، مێدیا ، میزدان ، مەردان ، کورد، مەند ، قەند ، سندە بەرد ، دەسندەخۆر ، وەردێنە ...**

## دەنگی چەقیوی(ر) = (ر)ی سووک :

**ئەم پیتەش هەر وەکی پیتی ( د )، جگە لەم نۆ پیتانە:( ا . د . ڕ . ز . ژ . و . وو . ۆ . ە)، هەموو پیتەکانی تری پێوە دەلکێن. ئەم پیتە چەقیوە قەت لە سەرەتای وشە دا نایە، بەڵکوو جێگاکەی نێوەڕاست و ئاخری وشەیە. وەک :**

**سەرباز ، سەردار ، ئاران ، دەرزی ، زەرەر ، زۆر ، پردەباز(بەردەباز)...**

## دەنگی چەقیوی (ڕ) = (ڕ)ی گران :

**ئەم پیتەش هەر وەکی پیتی (ر)ی سووک دەنووسرێت، بەڵام جیاوازییەکەیان لە نووسیندا ئەمەیە کە (ڕ)ی گران چەڵەمەیەکی لە ژێرەوەی دا دەندرێت و، لە کاتی هاوێژ (تەلەفوز)یش داکەمێک قەڵەو و قورس و گرانترلە دەم دێتە دەر. ئەم دەنگە چەقیوەش جگە لەم نۆ پیتانە: ( ا . د . ر . ز . ژ . و . وو . ۆ . ە)، هەموو پیتەکانی تری پێوە دەلکێن. دەنگبزوێنی (ڕ) ی گران بە پێچەوانەی پیتی (ر)ی سووک، لە هەموو شوێنەکانی وشە دا جێ دەگرێت. وەک :**

**ڕێوی ، ڕەش ، ڕزگار ، ڕەوەز ، مەڕ ، گاڕان، پاڕانەوە، پەڕەوەزە ، دڕ ، خڕ ، شەڕ ، شڕ ، باڕ ، سڕ ...**

## دەنگی چەقیوی ( ز ) :

ئەم پیتە لە بنەماڵەی (ڕ . ر .ژ)یە . لە ڕیزەی پیتە خاڵدارەکانە و خاڵەکەی دەکەوێتە سەر تەپڵی سەری.
جگە لە نۆ پیتی:( ا . د . ڕ . ر .ژ . و . وو . ۆ . ە )، هەموو پیتەکانی تری پێوە دەلکێن. ئەم پیتە دەتوانی لە هەموو شوێنەکانی وشە دا خۆ بنوێنێت. وەک :

**زانا ، زیرەک ، زەمەند ، زۆرک ، دەرزی ، مزگێنی ، ڕاز ، ڕەوەز ، بەرز ، بەرەزا**(یەکەمین منداڵ یان بێچوو) ، **بەڕەزا**( گیایەکی نەرمیلەی وردیلەی زۆر جوانە، کە لە قەد و نواڵەی شاخەکانی کوردستاندا دەڕوێت)...

## دەنگی چەقیوی ( ژ ) :

ئەم پیتە لە بنەماڵەی ( ز . ڕ . ر)یە و هەرچی دەربارەی پیتی ( ز ) گوتمان بۆ پیتی (ژ)یش بەکارە.
وەک :

**ژوان ، ژەنگ ، ژیار**(شارستانییەت) ، **برژانگ ، گێژاو ، وێژینگ**(وەنەوز) **بێژینگ ، گەلاوێژ ، کەژ ، مێوژ ، گێوژ ...**

## دەنگی چەقیوی ( سـ . س) دەنگی چەقیوی ( شـ . ش ) :

ئەم دوو دەنگە چەقیوە لە یەک بنەماڵەن. هەر دووکیان تیپی گەورەو بچووکیان هەیە. بچووکەکانیان کلکدارن و کلکیان دەکەوێتە سەر خەتی ڕاکشاوی سەر لاپەڕەی کاغەز( خەتی زەمینە). بەشێک لە دەنگ و دەنگبزوێنەکانیان پێوە دەلکێت و لە لای کلکەوە بە هەموو دەنگ و دەنگبزوێنەکانەوە دەلکێن. تیپی مەزنی ( س ) و ( ش ) دەتوانن لە ئاخری وشەدا بە تەنیا بێن ، یان بە پیتە کلکدارەکانەوە بلکێن. تیپی بچووکی هەر دوویان کلکدارن و خاوەنی تایبەتمەندییەکانی پیتی کلکدارن. دەنگی(شـ . ش)ی بچووک خاڵدارە و سێ خاڵەکانی دەکەوێتە سەرەوەی . ئەم دوو پیتە چەقیوە دەتوانن لە هەموو شوێنەکانی وشە دا ، بەم چەشنە خۆ بنوێنن:

( سـ ، ـسـ ، ـس ، س ) ــــ ( شـ ، ـشـ ، ـش ، ش )

وەک :

**سارد ، گیسک ، پیس ، داس ــــ شار ، مشار ، ڕیش ، مامەش** ( ناوی هۆزێکی مەزن و ئازای کوردە لە ناوچەی مەهاباد دا دەژین).

## دەنگی چەقیوی ( عـ . ع ) دەنگی چەقیوی ( غـ . غ ) :

ئەم دوو پیتە چەقیوە لە یەک بنەماڵەن. هەر دووکیان تیپی گەورەو بچووکیان هەیە. بچووکەکانیان کلکدارن و کلکیان دەکەوێتە سەر خەتی ڕاکشاوی سەر لاپەڕەی کاغەز( خەتی زەمینە). بەشێک لە دەنگ و دەنگبزوێنەکانیان پێوە دەلکێن و لە لای کلکەوە بە هەموو دەنگ و دەنگبزوێنەکانەوە دەلکێن.تیپی مەزنی (ع) و (غ ) دەتوانن لە ئاخری وشەدا بە تەنیا بێن ، یان بە پیتە کلکدارەکانەوە بلکێن. دەنگی( غـ . غ ) خاڵدارە و خاڵەکەی دەکەوێتە سەر تەپڵی سەری. ئەم دوو پیتە چەقیوە دەتوانن لە هەموو شوێنەکانی وشە ، بەم چەشنە خۆ بنوێنن:

( عـ . ـعـ . ـع . ع ) — ( غـ . ـغـ . ـغ . غ )

لە زمانی کوردیدا ژمارەی ئەو وشانەی کە ئەم دوو دەنگە چەقیوانەیان تێدا دەکار دەکرێت، کەم و دەگمەنن.

وەک : عەلی ، عەوداڵ ، عێل و عەشیرەت ، باعەی بزن و مەڕ ...

باغ ، غونچە ، لغاو ، ولاغ ، ساغ ، یەساغ ...

## دەنگی چەقیوی ( فـ . ف ) :

ئەم دەنگە، تیپی گەورە و بچووکی هەیە. پیتێکی خاڵدارە و تاکە خاڵەکەی دەکەوێتە بان بازنە بچکۆڵەکەی سەرەتای پیتەکە. تیپی بچووکی کلکدارە و کلکی دەکەوێتە سەر خەتی زەمینە و لە هەر دووک بەرانەوە توانای پێوە لکانی پیتی تری هەیە. تیپی مەزنی ئەم دەنگە چەقیوە، لە ئاخری وشە دا بە تەنیا، یان چەسپاو بە کلکی پیتێکی ترەوە خۆ دەنوێنێت. ئەم پیتەش لە وشەی کوردیدا بەم چوار حاڵەتی ژێرەوە دەبیندرێت: ( فـ . ـفـ . ـف . ف ) . وەک :

فێنک ، فۆتە ، فشەدۆست ، تریفە ، تفەنگ ، گفت ، کیف ، تف ، گەف و گیف ، ساف ، کەف ، ماف ، پف...

## دەنگی چەقیوی (قـ . ق) :

ئەم دەنگە چەقیوە، خاڵدارە و دوو خاڵەکەی دەکەوێتە سەر بازنە بچکۆلانەکەی دەسپێکی پیت. هەرچی دەربارەی دەنگی چەقیوی( فـ . ف ) دا گوتمان ، لە بارەی دەنگی(قـ . ق)یش دا بە کارە.

وەک :

**قسە ، قامک ، قاز ، بریقە ، مقەست ، چەقەڵ ، چەق چەقە**(گیایەکی خۆڕستە، شیرەیەکی لە ڕیشە دێتە دەرێ، کە دەکرێ وەکی چەقە خۆش بکرێ و بجووترێ.) ، **عاشق ، دیق ، لق ، لەق ، لاق ، ڕەق ، زەق ، تەق ...**

## دەنگی چەقیوی ( ڤـ . ڤ ) :

دەنگی چەقیوی ( ڤـ . ڤ ) ، پیتێکی خاڵدارە و سێ خاڵەکانی دەکەونە سەر تەپڵی سەری کەوانە بچکۆلەکەی سەرەتای پیتەکە. ئەم پیتەش لە بنەماڵەی پیتی چەقیوی (فـ . ف)یە و هەرچی دەربارەی ئەو دا گوتمان ، بۆ ئەمەیش ڕاستە . وەک :

**ڤینگە ، ڤژە ، تاڤگە ، بڤە ، سولاڤ ، هەیڤ ، پەیڤ ، پێڵاڤ ، مرۆڤ ، تەڤ**(بەتێکرا، هەموو) ...

## دەنگی چەقیوی (کـ . ک ) ، دەنگی چەقیوی ( گـ . گ ):

ئەم دوو پیتە لە یەک بنەماڵەن. دووکیان تیپی گەورە و بچووکیان هەیە و بێ خاڵیشن . تیپی بچووکی هەرتکیان کلکدارن و کلکیان دەکەوێتە سەر خەتی زەمینە. لە کلکەوە بە هەموو دەنگەکانەوە دەلکێن. تیپی مەزنیان لە ئاخری وشە دا دەتوانێ هەم بە تەنیا بێت و هەمیش بە کلکی پیتێکی ترەوە بلکێت. ئەم دوو پیتە لە وشە دا بەم چوار شێوەیە دەتوانن خۆ بنوێنن: ( کـ . ـکـ . ـک . ک ) وەک :

**کاوە ، کار ، کەم ، چکۆڵە ، تێکۆشین ، تێکوشین ، چڵکاو ، مێشک ، وشک ، تاریک ، پاک ، چاک ، بووک ...**

( گـ . ـگـ . ـگ . گ ) . وەک :

**گزگل**( قەلەموونە ، عەلەشیش ) **گرگن**(زگ زل) ، **گەلا ، هەنگاو ، پەنگر ، مێگەل ، مانگ ، ڕەنگ ، قورینگ ، سەگ ، گورگ ، ڕەگ ...**

[شایانی باسە بگوترێ کە ئەگەر لە وشەیەکدا دوو پیتی چەقیوی (ک) و (گ) بکەونە پێشەوەی (ی ، ێ ، وێ)، لە زاراوەی موکریانی و هەندە ناوچەیەکی تری کوردستاندا، کاتی گوتن و خوێندنەوەی ئەو دووپیتانە لە وشەدا، زمان لە مەلاشوو نزیک دەبێتەوە و دەنگی ئەم دوو پیتە چەقیوە تووشی گۆڕان و شێوان دێت. لە جیاتی دەنگی(ک) و (گ)، دەنگێکی نێوان (چ) و (ج) بە گوێ دەگات. لەم حاڵەتەدا ئەم دوو دەنگە چەقیوە، (کاف)ی شێواو و (گاف)ی شێواویان پێ دەگوترێت . وەک :

کیفار، کێو، کێرد، کێم، کێل، کیتەڵە ، کیسەڵ ، کوێر ، گێرە و کێشە، گیا ، گێزەر ، گێل، گوێ ، گێوژ ، گیرفان ، گوێرەکە ، گوێلک ، گێلگێلە...

دەنگی چەقیوی (لــ . ل ) = ( لــ . ل )ی کز

دەنگی چەقیوی ( ڵــ . ڵ ) = (ڵــ . ڵ )ی قەڵەو

ئەم دوو پیتە لە یەک بنەماڵەن. هەردووکیان تیپی بچووک و مەزنیان هەیە و بێ خاڵن. دەنگی (ڵــ . ڵ )ی چەڵەمەدارە و چەڵەمەکەی دەکەوێتە سەرەوەی پیتەکە. بچووکەکانی هەر دووکیان کلکدارن و کلکیان لەکاتی نووسین، لە وشەدا، دەکەونە سەر خەتی زەمینە. پیتی (ڵــ . ڵ) قەڵەو لە سەرەتای وشە دا نایە ، بەڵام ئەوەی تریان لە هەموو شوێنەکانی وشە دا دێت. تیپی بچووکی ئەم پیتانە لە هەردووک بەرانەوە بە دەنگ و دەنگبزوێنەکانەوە دەلکێن. پیتی (لــ . ل ) بەم چوار حاڵەتەی ژێرەوە دەتوانێ لە هەموو بەشەکانی وشە دا بێت: ( لــ . ـلـ . ـل . ل ) وەک :

لۆ(گیایەکی باڵابەرزی گەڵاباریکی خۆڕستە لە کوێستانەکانی کوردستاندا دەڕوێت.)، لانک، لووس، لۆکە، پشیلە ، سەبیلە ، مەلە ،شیلە، کلک ، پیل(لاشان) ، دیل ، جل ، گەل ، قەل ، زل ، مل ، گول(دووزام= نەخۆشینێکی خەمبارانەیە .) ...

پیتی(ڵــ . ڵ)ی قەڵەو ، هەر بەم سێ حاڵەتەی ژێرەوە لە وشەدا خۆ دەنوێنێت: (ـڵـ . ـڵ . ڵ ) وەک :
کەڵەگەت ، بەڵاڵووک ، ئاڵۆز ، گڵ ، شتڵ ، چقڵ ، چەقەڵ ، دڵ ، گوڵ ، تاڵ ، ماڵ ، منداڵ ، شەماڵ ، گەواڵ...

دەنگی چەقیوی (مــ . م ) : ئەم دەنگە دوو تیپی گەورە و بچووکی هەیە. پیتێکی بێ خاڵە. بچووکەکەی کلکدارە و هەر وەک هەموو پیتە کلکدارەکان دەتوانی بە پیتەکانی ترەوە بچەسپێت. تیپی

گەورەکەی لەئاخری وشە دا دێت. تیپی گەورەکەی، لە وشەی کوردیدا دەتوانێ بە دەنگ و دەنگبزوێنە کلکدارەکانەوە بلکێت و هەمیش دەتوانێ بە تەنیا بێت. ئەم دەنگە لە وشەی کوردیدا بەم چوار حاڵەتانە دا خۆی نیشان دەدات:

(مــ . ــمــ . ــم . م ) وەک :

**مار ، مشک ، مانگ ، هێمن ، سمێڵ ، سـمۆرە، جاجم ، کەریم، نم ، زەلام، تەم ، شەم...**

## دەنگی چەقیوی (نــ . ن ):

ئەم دەنگە دوو تیپی گەورە و بچووکی هەیە. پیتێکی خاڵدارە و خاڵەکەی دەکەوێتە نێو زگی پیتەکەوە. بچووکەکەی کلکدارە و هەر وەک هەموو پیتە کلکدارەکان دەتوانی بە پیتەکانی ترەوە بچەسپێت. تیپی گەورەکەی بێ کلکە و لەئاخری وشە دا دێت. تیپی گەورەکەی، لە وشەی کوردیدا دەتوانێ بە دەنگ و دەنگبزوێنە کلکدارەکانەوە بلکێت و هەمیش دەتوانێ بە تەنیا بێت. ئەم دەنگە لە وشەی کوردیدا بەم چوار حاڵەتانە دا خۆی نیشان دەدات:

( نــ. ــنــ . ــن. ن) وەک :

**نان، نەرم، ناو، بڵند، بناوان، گزنگ، گرگن، چڵمن، نەوسن، بزن، بەران، شوان، گاوان...**

## دەنگی چەقیوی (هــ)ی سادە:

ئەم دەنگە لە ئاخافتن و نووسینی زمانی کوردی دا زۆر کەمە و بە دەگمەن بە کار دێت. ئەم پیتە لە وشەی کوردیدا بەم دوو وێنەیە دێت و لە هەموو شوێنەکانی وشەدا خۆ دەنوێنێت: ( هــ . ــهــ)

وەک :

**هێمن، هاوڕێ، هەنار، هەنجیرـ گوناهــ ، نهێنی، کەلـهوڕ، زمهەر، بەهار، دەهۆڵ، سەهۆڵ...**

## وشە لە زمانی کوردیدا

وشەی خاوەن مانای زمانی کوردی بە پێی ژمارەی ئەو گشتە دەنگ و دەنگبزوێنانەی کە تێیدا دەکار دەچێت، دەبێتە خاوەنی مووزیک و هەوا و ئاهەنگێک، کە ئێمە لێرەدا پێی دەڵێین: کەرت، یان (سیلاب).
بۆ وێنە ئەگەر سەیری ئەم وشە گەلەی خوارەوە بکەین و لە باری ئاهەنگ و مووزیکەو پێکەوە هەڵیان سەنگێنین، بۆمان دەر دەکەوێت کە زیادی و کەمیی ژمارەی دەنگ و دەنگبزوێنەکانە، کە لە وشەی کوردی دا دەبێتە هۆی وەدی هاتنی مووزیکی وتن و ئاخاوتن.

1( دۆ) ... 2(هێدی)... 3(بەردەپان)... 4(سەربازخانە)... 5( شەمشەمەکوێرە)...

1. دۆ = [ دەنگ + دەنگبزوێن]

2. هێدی = [ دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگبزوێن]

3. بەردەپان = [ دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ ]

4. سەربازخانە = [ دەنگ + دەنگبزوێن+ دەنگ + دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگبزوێن]

5. شەمشەمەکوێرە = [ دەنگ + دەنگبزوێن+ دەنگ+ دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگ + دەنگبزوێن + دەنگ + دەنگبزوێن ]

نموونەی فورمولی دەنگ و دەنگبزوێنەکانی وشەگەلەکەی سەروو :

1. دۆ =CV

2. هێدی= CVCV

3. بەردەپان = CCCVCCVCVC

4. سەربازخانە =CVCCVCCVCV

**5.** شەمشەمەکوێرە =CVCCVCVCCVCV

1 ـ دۆ = وشەی (دۆ) لە دەنگی چەقیوی(د) و دەنگبزوێنی (ۆ)ی قەڵەو ساز بووە. ئەم وشەیە ئەوەندە کورتە، کە ئەگەر دەستێکمان بەرز بکەینەوە و هاوکات دەگەڵ گوتنی وشەی(دۆ)، دەستەکەمان بخەینە خوارەوە، گوتنی وشەی (دۆ) و هاتنەخوارەوەی دەستەکمان هاوکات دەبن. هەر وشەیەک، کە گوتنەکەی دەگەڵ یەکجار دەست ڕاتڵەکاندنی دەست لە دەمدا کۆتایی بێت، وشەی دەڵێن ئەو وشەیە، وشەیەکی یەک یەک کەرتی یە. بۆ وێنە ئەم وشانەی خوارەوە یەک کەرتین:

**ساز ، ئاو ، چاو، دار ، داو ، کەو ، مار ، کەر ، بار، شار...**

2 ـ هێدی : وشەی هێدی لەم ئەجزایە ساز بووە: [دەنگ، دەنگبزوێن، دەنگ، دەنگبزوێن]. ئەگەر باڵی ڕاستمان بەرز بکەینەوە و هاوکات دەگەڵ گوتنی (هێــ)، دەستەکەمان بخەینە خوار؛ ئەمجار دەستی چەپمان بەرز بکەینەوە و هاوکات دەگەڵ گوتنی (دی) دەستەکەمان بخەینە خوار، گوتنی وشەی هێدی دەگەڵ دوو جار دەست ڕاتڵەکاندن لە دەمدا کۆتایی پێ دێت؛ جارێک دەستی ڕاست دەگەڵ بەشی یەکەم، واتە (هێــ) و جاری دووەم دەستی چەپ دەگەڵ بەشی دووەم، واتە (دی ).

کەواتە وشەی هێدی دوو بەشە ؛ بەشی یەکەم (هێــ) ... بەشی دووەم (دی).

چەند نموونە بۆ وشەی دوو کەرتی :

**دیوار، دەرمان ، کاوە، کۆتر ، پەنیر ، سەرباز، سامان ، دارا، ئاوات...**

3 ـ بەردەپان : وشەی بەردەپان لە سێ کەرتی [بەر]، [دە] ، [پان] ساز بووە. بۆ هەر بەشەی وشەی بەردەپان، سێ جاران باسک دەبەینە سەر و دەیخەینەوە خوار. جاری یەکەم دەگەڵ[بەر] ، جاری دووەم دەگەڵ[دە] و جاری سێ دەگەڵ [پان].

بەشی یەکەمی وشەی بەردەپان، واتە[بەر] لە دەنگی (بــ)ی بچووک و دەنگبزوێنی(ە) و دەنگی (ر)ی سووک، ساز بووە.

بەشی دووی وشەی بەردەپان، واتە [دە]، لە دەنگی (د) و دەنگبزوێنی(ە)پێک هاتووە.

بەشی سێی وشەی بەردەپان، واتە[پان] لەم ئەجزایە پێک هاتووە: دەنگی[پــ]ی بچووک، دەنگبزوێنی (ا) و دەنگی (ن)ی گەورە ساز بووە.چەند نموونە وشەی دوو کەرتی:

**دەوەرێ ، دەزگرە(دەستگرە)، مەهاباد، چەمچەماڵ، مەولەوی، دیوەخان**

4 ـ **سەربازخانە** : وشەی سەربازخانە لەم چوار کەرتانە و هەر کەرتەی لەم ئەجزایە پێک هاتووە:

. [سەر]= 1. دەنگی (سـ) بچووک، دەنگبزوێنی(ە) ، دەنگی(ر)ی سووک.

..[باز] = 2 . دەنگی(بـ)ی بچووک ، دەنگبزوێنی(ا)، دەنگی (ز).

...[خا]=3 . دەنگی(خـ)ی بچووک، دەنگبزوێنی (ا).

....[نە] 4 . دەنگی(نـ)ی بچووک ، دەنگبزوێنی (ە).

بۆ دابەشکردنی وشەی (سەربازخانە)، پێویستە چوارجاران دەست هەڵببڕین و، دەگەڵ هەر جارەیش، یەکێک لە بەشەکانی [سەر]، [باز] ، [خا] ، [نە] بڵێین و دەستەکەمان بخەینەوە خوار.

**شەمشەمەکوێرە** : وشەی شەمشەمەکوێرە، وشەیەکی لێکدراوە و لە دوو وشەی[(شەمشەمە) ـ (کوێرە)][ یان[ (شەو شەوە) ـ (کوێرە)]ساز بووە. وشەی لێکدراوی [شەمشەمەکوێرە] بە تێکرا، وشەیەکی پێنج کەرتییە. پێنج کەرتەکانی و ئەجزای پێکهێنەری هەر کەرتی ئەم وشەیە، بەمجۆرەن:

.[شەمـ] = 1 . دەنگی(شـ)ی بچووک، دەنگبزوێنی(ە)، دەنگی(مـ)ی بچووک.

..[شە] = 2 . دەنگی (شـ)ی بچووک، دەنگبزوێنی (ە).

... [مە] = 3 . دەنگی (مـ)ی بچووک ، دەنگبزوێنی (ە) .

.... [کوێـ] = 4 . دەنگی(کـ)ی بچووک، دەنگی چەقیوی(و)، دەنگبزوێنی(یـ)خاو.

..... [رە] = 5 . دەنگی(ر)ی کز، دەنگبزوێنی(ە).

شایانی باسە بگوترێ کە ژمارەی وشەی چوارکەرتی و پێنج و شەش کەرتی لە نووسین و ئاخاوتنی زمانی کوردی دا زۆر کەم و بە دەگمەنن.



